CORONAVIRUS

COVID-19

د. جەعفەر گوانی

# کۆرۆنا

منتدى إقرأ الثقافي

www.iqra.ahlamontada.com

سەربازێکی تۆڵەستێن

یان تاقیکردنەوەیەکی دژوار





# کۆرۆنا

## سەربازێکی تۆڵەستێن یان تاقیکردنەوەیەکی دژوار

### نووسینی : د. جەعفەر گوانی

مافی لە چاپدانەوەی پارێزراوە بۆ نوسینگەی تەفسیر

چاپی یەکەم ١٤٤١ك - ٢٠٢٠ز



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێرست - نوسینگەی تەفسیر
گوانی، جەعفەر گوانی
کۆرۆنا سەربازێکی تۆڵەستێن یان تاقیکردنەوەیەکی دژوار، د. جەعفەر گوانی (نووسەر)،
١٥٠ لاپەڕە،
١٤* ٢١ سم
بابەت، ئاینیی
ISBN: 978-9922-632-19-3

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٢٤٣) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە.

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

دیزاین: عمر عثمان عمر
خەتی بەرگ: نەوزاد کۆیی

## پێشەکی:

لەگەڵ نووسینی ئەم نامیلکەیە، ڤایرۆسێکی کوشندە یەخەی تەواوی مرۆڤایەتی گرتووە، لە رۆژهەڵاتەوە تا رۆژئاوا، لە باکوورەوە، تا باشوور، هەموان بە دەستییەوە دەناڵێنن، ڤایرۆسێك لە چین دروست بووە، تەنگی بە هەموو شوێنێکی دونیا هەڵچنیوە.

کەسانێك ئەم ڤایرۆسە وەکو سەربازێکی خوایی بۆ تۆڵەی مسوڵمانە (ئیگۆرەکانی) چین دەناسێنن، کە بەهۆی بێدەنگی خەڵک لە شوێنەکانی دیکەش بڵاودەبێتەوە،بۆ ئەم مەبەستە دەستەواژەی جۆراوجۆر دروستبوون، تا گەیشتە ناو وتاری هەینی و، دیمانەکانی تەلەفزیۆن و، سروودو گۆرانیشەوە.

لێرەدا تیشکخستنە سەر رەهەندە جیاوازەکانی ئەم تێگەیشتنە ئەرکێکی پێویستە، ئایا بۆچی خەڵکانێك دەیانەوێت ئەمە وەکو تۆڵە بناسێنن؟

ئایا لێکەوتەکانی ئەم تێگەیشتنە چین؟

ئەگەر تۆڵەیە چۆن تۆڵەیە؟

ئەگینا چۆن دەبێتە تۆڵە؟

تۆڵەو تاقیکردنەوە، چ جیاوازییەکیان هەیە؟

لەم کتێبەدا تەنیا قسە لەسەر ئەم نەخۆشییە ناکرێت،

بەڵکو باسەکە فراوانتر دەبێت، بۆ چوونە ناو سەرجەم بابەتەکانی هاوشێوە.

لەو نووسینەدا باسی لێکدانەوە سیاسیی و ئابووریی و پیلانگێڕییەکان ناکرێت، یان جیهان چی بەسەر دێت و بەرەو کوێ دەڕوات.

بەو هیوایەی بابەتەکە بەرچاوڕوونیەك بێت و لە داهاتوودا لێکۆڵینەوەی زیاتری لەسەر بکرێت.

خوای گەورە لێمان قبوڵ بکات، کە ئەگەر تەوفیقی ئەو نەبوایە، بایی عانەیەکیشمان پێ نەدەنووسرا.

جەعفەر گوانی

٢٠٢٠/٤/٨

هەولێر

## ئایا کۆرۆنا تۆڵەی خوایە؟!

ساڵی (٢٠٢٠) بۆ هەموو جیهان ساڵێکی پڕ ناخۆشی بوو، ڤایرۆسێکی بکوژ لە ناوەڕاستی مانگی دیسێمبەری ساڵی (٢٠١٩) لە شاری (ووهان)ی چین دەرکەوت لە خێزانی ڤایرۆسی (کۆرۆنا) کە ناوە زانستییەکەی کرایە (کۆڤید ١٩)و هەزاران کەسی کوشت. هەواڵەکان بڵاویان کردەوە ئەم ڤایرۆسە لە رێگەی گیاندارانی وەك (شەمشەمەکوێرەو مارو سەگ)و جۆرە کێوییەکانی دیکە دروست دەبێت، کاتێکیش بۆ مرۆڤ گوازرایەوە بەخێرایی بڵاودەبێتەوە. چینییەکان گیرۆدەی نەریتێکی خۆیان بوونە کە بەردەوام بەتایبەتی لە رۆژێکی تایبەتدا گۆشتی کێوییەکان دەخۆن. رێکخراوەکانی پاراستنی گیاندارە کێوییەکان هانی خەڵکیان دەدا توخنی ئەو خواردنانە نەکەون، هەروەها دەوڵەت گەمارۆیەکی توندی خستبووە سەریان، لێ ئەوان کۆڵیان نەدەداو بەشێوەی یاسایی و نایاسایی هەموو جۆرە ئاژەڵێکیان هێناو گۆشتی سەگ و پشیلەو شەمشەمەکوێرەو هەرچی بە بیری مرۆڤدا نایەت، لە عەردیان دەدان و گێڕیان دەکردن و دەیانخواردن.

دوای بڵاوبوونەوەی پەتاکە بەجۆرێك شارەکەی پەکخست، دەوڵەت قەدەغەی هاتووچۆی راگەیاندو کەس بۆی نەبوو لە

ماڵی بێتە دەرەوە. لەگەڵ ئەو ڕێکارە بۆ یەکەمجار ناوی (کەرەنتینە) بە مانای دابڕاندن و هێشتنەوەی خەڵك لە وڵاتی ئێمەش بڵاوبوویەوە. ئا لێرەوە باس و خواسی چین کەوتە ناو وتاری ئایینی، بەتایبەتی (چین) لە رووی ئایینەوە شیوعییە، هەروەها کێشەیەکیشی لەگەڵ تورکە ئیگۆرەکان هەیە کە بەشی زۆریان مسوڵمانن، ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی مافی مرۆڤ بەتایبەتی (هیومان رایتس ووچ) باس لە چەوساندنەوەو سەرکوتکردنی ئەو گەلە دەکات لەلایەن چینەوە. دیندارەکان هاتنە قسە دەربارەی ڤایرۆسەکە، بەتایبەتی هەندێکیان بە شەڕی خوایان هەژمار دەکرد، کە لە خوارەوە چەند نموونەیەك دێنینەوە:

**قەشەیەکی ئەمریکی: هۆکارەکەی بێدینی و ئیلحادە**

قەشە (ریك وایلز) گەورەی قەشەکانی کڵێسای ( Flowing Streams Church) پێیوایە "ڤایرۆسی کۆرۆنا فریشتەی مەرگە لەلایەن خواوە بۆ پاککردنەوەی زەمین لە گوناهـ"، "ئەوە پەتایەکی راستەقینەیە هاتۆتە سەر زەوی، زۆری نەماوە خوا ئەم هەسارەیە لە زۆری گوناهەکان پاک بکاتەوە". ئینجا کەوتە بەر لۆمەی خەڵکی ئەمریکا بەتایبەتی باوکی ئەو منداڵانەی تووشی رەگەزبازی بوونە، هەروەها ئەو "قێزەونییەی لەسەر تەلەفزیۆن و فیلمەکانمان هەیە". بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسی

بە حوکم و بڕیارێکی خودا هەژمار کرد. هەروەها لە باسی (چین)ـەوە قەشە گوتی: "ئەو حکومەتێکی شیوعی مولحید و بێ دینەو کریستیاکان دەچەوسێنێتەوەو خەڵکی ناچاری لەباربردن دەکات". هەروەها دووپاتی کردەوە کە "پەتایەکان یەکێکن لە دواهەمین قۆناغەکانی حوکم و دەسەڵات". ئینجا کۆمەڵێك هۆشداری دایە ئەمریکییەکان و گوتی: "دیقەت بدەنە ئەو هەڵگەڕانەوە رۆحانییەی لەم وڵاتە (ئەمریکا) هەیە، رق لە خوا، رق لە ئینجیل (کتێبی پیرۆز)، رق لە چاکە... بەڕاستی مایەی بێزهاتنەوەیە کاتێك دەروانییە خەڵکی ئەم وڵاتە کە ئێستا نەشتەرگەری گۆڕینی رەگەزی منداڵەکان ئەنجام دەدەن... ئاوڕ بدەنەوە لە کردارەکانی دەستدرێژی و قێزەونی سێکسی، ئەو قێزەونییەی لەسەر تەلەفزیۆن و لە ناو فیلمەکانمان هەیە"، "ئێستا فریشتەی مەرگ دەسووڕێتەوە، ئا ئەمە کاتی گونجاوە بۆ ئاشتبوونەوە لەگەڵ خودا".

**پیاوێکی ئایینی هیندۆس:**

**ڤایرۆسی کۆرۆنا بەرجەستەبوونی فیشنۆی خودایە بۆ سزادانی گۆشتخۆرەکان.**

تشاکرابی ماهاراج، سیاسەتمەردارو پیاوی ئایینی هیندۆس، رێبەری رێکخراوی (هیندۆ مهاسبا) دەڵێت: ڤایرۆسی کۆرۆنا بەرجەستەبوونی فیشنۆی خودایە بۆ سزادانی گۆشتخۆرەکان.

ماهاراج پێیوایە کۆرۆنا لە راستیدا (ئاڤاتار)ە، واتە ئەو خودایەیە کە ناوی (فیشنۆ)یە هاتۆتەخوارەوەو بۆتە لاشەی (ڤایرۆسەکە) بۆ سزادانی ئەوانەی ناگیایی و (گۆشتخۆرن). فیشنۆ لە لاشەی (پیاوە شێرەکە) گۆڕاوە بۆ شێوەیەکی نوێ لە پێناوی سزادانی چینییەکان و پێدانی دەرس و وانەیەک، ئەمەش بەهۆی هەڵستانیان بە سزادانی گیانداران، هەروەها تا بیانکاتە گیایی.

ئەو دەڵێت: "کۆرۆنا ڤایرۆس نییە، بەڵکو ئاڤاتارە بۆ پاراستنی بوونەوەرە هەژارەکان". داوای لە (شی جی بینگ)ی سەرۆکی چین کرد تا "پەیکەرێك بۆ کۆرۆنا دروست بکات و داوای لێبووردن بکات"، ئەو کاتی "تووڕەیی کۆرۆنا دەڕوات".

رێبەرە هیندۆسەکە پێیوایە: "باوەڕدارە هیندەکان و پارێزەرانی مانگا لە کۆرۆنا پارێزراون".

### حاخامێکی جوو:

## کۆرۆنا تۆڵەی خوایە دژی چینییەکان.

یەهودا غلیک، حاخامێکی جووە، ئەندامی پێشووی پارتی لیکۆد بووە، ئەویش لە بەرامبەر (کێوی هەیکەل) راوەستاوەو لە خودا دەپاڕێتەوە کە ڤایرۆسەکە رابگرێت. ئینجا دەست دەکاتە باسی سنووربەزاندنی حکومەتی چین و کۆرۆنای بە (تۆڵەی خودا) ناوبردووە دژی دەسەڵاتدارانی چین بەهۆی "پێشێلکردنی

مافەکانی مرۆڤ و چەوساندنەوەی باوەڕدارانی کتێبی پیرۆز و چالاکوانە سیاسییەکان".

دەڵێت: "دڵمان لەگەڵ قوربانیانی کۆرۆنا دایە، بەڵام ئەوە هۆشدارییە بۆ دەسەڵاتدارانی چین... دەست هەڵگرن لە چەوساندنەوەی باوەڕداران، دەستهەڵگرن لە ناچارکردنی خەڵکی بۆ سوخرەو کارکرنی ناچاری، دەستهەڵگرن لە لێکردنەوەی ئەندامانی لاشەی زیندانییە سیاسییەکان". "ئەوە شەڕو خراپەکارییە، کارێکە لەلایەن خواوە مایەی تووڕەبوونە، خوا فەرموویەتی کە خراپەکاران سزا دەدات"، "هیوادارم حکومەتی چین راوەستێت و خەشمی خوا بۆ وڵاتەکەی نەهێنێت".

#### زانایانی مسوڵمان:

### کۆرۆنا تۆڵەی خوایە بۆ مسوڵمانەکانی ئیگۆر

مسوڵمانانیش بە هەمان شێوەی شوێنکەوتوانی ئایینەکانی دیکە بەشێکیان هەمان تەفسیرو تێگەیشتنیان هەبوو، بەتایبەتی بە تۆڵەی مسوڵمانانی ئیگۆر هەژماریان دەکرد. لەوانە د. ئەحمەد عیسا معەسراوی سەرۆکی پێشووی لیژنەی پێداچوونەوەی قورئانی پیرۆز لە ئەزهەر، تویتێکی نووسی: "خوای گەورە چینی لە جیهان دابڕاند، دوای ئەوەی چین زیاتر لە پێنج ملیۆن مسوڵمانی ئیگۆری دابڕاند". بانگخوازێکی

تونسـی بەنـاوی بەشـیر حەسـەن گـوتی: "بەهـۆی ڤایرۆسـی کۆرۆنـاوە خـوای گەورە پشـتیوانی ئیگۆرەکـانی کـرد دژی دەسـەڵاتدارانی چینـی سـتەمکار". هەروەهـا بـانگخوازێکی مەغـریبیش بەنـاوی حەسـەن کەتـانی وێنەیەکـی بڵاوکـردەوە لەسـەری نووسـرا بـوو: "چـین هەژدە ملیـۆن کەسـی چینـی دادەبڕێنێـت بەهـۆی ڤایرۆسـی کۆرۆنـا، ئەمەش دوای ئەوەی هەڵسـتا بە کوشـتن و زینـدانیکردنی یەك ملیـۆن مسـوڵمان بەشێوەیەکی ستەمکاری و تاوانکـارانە... بێجگە لە خوا کەس سەربازەکانی نازانێت".



بە سکان کردنی ئەو بارکۆدە دەتوانن سەیری ڤیدیۆیەکان بکەن

لە کوردستانیش کۆمەڵێک مامۆستای ئایینی کەوتنە ژێر کاریگەری گوتاری بەشێکی عەرەبی، لە وتارو سمینارەکانیان هەمان دەستەواژەیان دووبارە دەکردنەوە. هەرچەندە کەسانێکی دیکە بەپێچەوانەوە دەیانگوت، کە شتی وا نییە، بۆنموونە (حەبیب عەلی ئەلجیفری) بانگخوازی یەمەنی، لە سمینارێکی قەڵەبالغی زانکۆییدا بە راشکاوی ئەوەی رەتکردەوە کە ڤایرۆسەکە هیچ پەیوەندی بەو بابەتانەوە هەبێت. هەروەها کۆمەڵە حاخامێکی جوو هەر زوو لەلای دیواری پیرۆز کۆبوونەوەو دوعای شیفایان بۆ چینییەکان دەکرد.

بەڵام ئەوەی چاوەڕوان نەدەکرا، پاش ئەوەی ئەم ڤایرۆسە بە چڕی لەو شارەی چین بڵاوبوویەوە، پەلی بەرەو وڵاتانی دیکەی دنیا هاوێشت، خەڵکێکی زۆر تووشی بوون، هەروەها خەڵکێکی زۆر بوونە قوربانی بەتایبەتی لە ئیتاڵیاو ئێران و ئەمەریکاو ئیسپانیا، ئەم دۆخە هێندە مەترسیدار بوو، ژیان بە تەواوی وەستا، ئێستا من کە ئەو دێڕانە دەنووسم، ئەوە بۆ زیاتر لە (٢٠) رۆژ دەڕوات لە ژوورەکانمان دانیشتووین، هیچ دەوامێک نەماوە، بێجگە لە نەخۆشخانەو پۆلیس و ئاسایش هەموو دائیرەکان راوەستاون، قوتابخانەو زانکۆو پەیمانگاکان هەموویان داخراون، بازاڕ هەمووی قەپاتە، ئەو هەولێرە وەکو چۆڵەوانی وایە. کارەکە هێندە ترسناک بوو دەرگای هەموو مزگەوت و

کڵێساو پەرستگەی تەواوی دینەکان داخراون، تا گەیشتە ئەوەی مزگەوتی مەککەی پیرۆزو مەدینەی منەوەرەو قودس سێ پیرۆزترین شوێنی مسوڵمانان بە رووی نوێژخوێنان داخران. لەولاوە ڤاتیکانی ناوەندی سەرەکی کلێسای مەسیحییە کاسۆلیکەکان و شوێنی پاپا، هەروەها تەواوی ئایینەکانی دیکەی سابیئە و ئێزدی و... لەو ناوچانە داخراون.

ئەم دۆخە گشتگیرو ترسناکە ئەو کەسانەی تووشی جۆرە ئیحراجییەك کرد کە پێشتر ڤایرۆسیان بە سەربازی خوا تەفسیر دەکردەوە. جۆرە پرسیارێکیشی لەلای خەڵکی بە گشتی و گەنجان بەتایبەتی دروست کرد، کە بۆچی ئەم لەشکرەی خودا رووی بەرەو پیرۆزترین شوێنەکان وەرگێرا، لە کاتێکدا ئێستا چین هیچ کێشەیەکی نەماوە، ئایا هەڵەکە لەوە بوو ئەو ڤایرۆسەیان بە سەربازی ونی خوا دانا، یان لەوە بوو (چین)ـیان بۆ دژایەتی هەڵبژارد، چونکە خەڵک دەپرسی خۆ شوێنی زۆر خراپتر هەن دژی مسوڵمانان، بۆچی بەرامبەر ئەوان نەبوو.

کەواتە هۆکاری هەڵبژاردنی ئەم بابەتە بۆ ئەم کێشمەکێشمە دەگەڕێتەوە.

## یاسا نەگۆڕو جێگیرەکان:

کاتێك دیقەت دەدەیتە ژیانی دونیا، کۆمەڵێك یاسای جێگیر بەڕێوەی دەبات، لەوانە یاسای کۆمەڵایەتی و یاسای ئابووری و یاسای هەژارو زەنگینی و یاسای فیزیایی و جوگرافی و ... خوای گەورە گەردوونی لەسەر کۆمەڵە یاسایەکی جێگیرو بە وردی دروست کردووە، لە ناویشیدا هەسارەی ئێمە وەکو هەموو بەشەکانی دیکەی گەردوون بە کۆمەڵە یاسایەکی جێگیرەوە راگرتووە. ئەم یاسا گەردوونیانە بەلێکدانەوەی وردی بیرکاری پێوانەکراون. لە وردی هێزی کێشان و بابەتی گەردیلەو نزیکی و دووری خۆرو مانگ و شێوازی سووڕانەوەو دروستبوونی وەرزەکان، بەجۆرێکە ئەگەر هیچ نوقسانی و کێماسییەك دروست ببێت ئەوە ژیان تێك دەچێت تا تێکچوونی گەردوون. کەچی چەندەها ساڵە بە هەمان شێوازو لەژێر هەمان یاساکان بە نەگۆڕی دەسووڕێتەوە. هەروەها هەندێك یاسای نەگۆڕیشی لەناو گەردوون داناوە کاروبارەکانی پێ دەسوڕێت، بۆنموونە ئاگر سووتێنەرە، هەرکەسێك دەستی لێبدات دەسووتێ، هەرکەسێك کارەبا بیگرێت ئازاری دەدات تا کوشتن، هەرکەسێك لەناو بەفرو سایەقە بمێنێتەوەو خۆی لە سەرما نەپارێزێت سڕ دەبێتەوەو گیانی دەردەچێت، ئەوەی بکەویتە دەریاو مەلەوانی نەزانێت

دەخنکێت جا لە هەر زمان و دین و شوێنێك بێت. ئەوانە کۆمەڵە یاسایەکی جێگیرن خوای گەورە دایناون و بۆ هەموو کەسێك باوەڕدارو بێباوەڕ وەکو یەکن و ناگۆڕێن. بە کورتی هەرلایەکی ئەم گەردوونە بەجۆرێکە پەیوەندییەکی وردو هاوسەنگ لەنێوان هەموو بەشەکانی هەیە، هەموو کارەکان وەکو خۆیان دەڕۆن و کارەکانی یەکتری تەواو دەکەن، ئەوانە بۆ هیچ کەسێك ناگۆڕێن، وەك خوای گەورە لەسەر زاری موسا پێغەمبەر دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ۝٥٠﴾ [طه الآية ٥٠].

واتە: "موسا وتی: پەروەردگارمان ئەو زاتەیە کە هەموو شتێکی بەتایبەتی و ڕێکو پێکی دروست کردووە، پاشان ڕێنموویی کردووە، تا بەچاکی دەوری خۆی ببینێت". ﴿إِنَّا كُلَّ شَىۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٍ ۝٤٩﴾ [القَمَر الآية ٤٩].

واتە: "بەراستی ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازەیەکی دیاریکراو درووستکردووە".

بەرامبەر بەو یاسا فیزیایی و جوگرافیانە، کۆمەڵە یاسایەکی کۆمەڵایەتی نەگۆڕیش هەن، ئەوانیش بەهەمان شێوە جێگیرن، بۆنموونە دادگەری مایەی بەختەوەری گشتییە، نادادگەری بەختەوەری گشتی تێکدەدات، وڵاتانێك هەن

سەرچاوەی گەورەی داراییان نییە، بەڵام لەبەرئەوەی بە جوانی و دادگەری وڵاتیان دەسووڕێنن جۆرە بەختەوەرییەکیان بۆ خەڵکەکەیان دابینکردووە. بەپێچەوانەوە هەرچەندە زەنگین بن ئەگەر جوان سووڕاندنی سامان و دادگەری کۆمەڵایەتی نەبێت، جگە لە نەهامەتی هیچی دیکە بۆ گەلانیان ناهێنن، بۆنموونە ئەفریقیا وێڕای ئەوەی سەرچاوەیەکی سەرەکی کۆمەڵە بابەتێکی سرووشتی وەك چاو و شەکرو قاوەو زێڕ و دەیان جۆری دیکەی سرووشتییە، وڵاتانی دونیا پێوەی خەنی بوونە، هەر لە ئەورووپاوە بگرە (بەریتانیا، فەرەنسا، هۆڵەندا، بەلجیکا، سوێد، ئەڵمانیا...) تا رۆژهەڵاتی وەکو (چین، هیندستان،...) لەم دواییانە تورکیاو وڵاتانی عەرەبیش، لەژێر ناوی جۆراوجۆر ملیان داوەتە فەرهوودکردنی سامانی ئەم کیشوەرە، لەوەدا کۆمەڵە کەسێکی دیکتاتۆر دەستیان خستۆتە ناو دەستیان، خەڵکەکەشی جگە لە نەهامەتی هیچی دیکەیان لێ نەدووریتەوە. کاتێك بۆ یەکەمجار چوومە نێجیریا واقم وڕما، یەکێك لە وڵاتە هەرە دەوڵەمەندەکانی نەوت لەسەر ئاستی دونیا، کەچی هەژارەکانی لە ئاستێکن تەنیا چاویان لە تاقە ژەمە نانێکی تێرە، خەڵك لەسەر گوفەکەکان خەریکی خڕکردنەوەی پاشماوەی دەوڵەمەندەکانن، زەنگینەکانیشیان شان لە شانی هەرە دەوڵەمەندەکانی دونیا دەدەن. کاتێك چوومە وڵاتێکی وەکو یۆگاندا چاوم بەو جوانییەی سرووشت کەوت،

هێندە دڵڕفێنە خۆشترین وڵاتانی دونیا ناگەنە ئەژنۆی، لەوێ کەش و هەوایەکیـــان هەیە هەمـــوو رۆژێ بەهـــارو نەورۆزە، خـاکێکی هەنـدە بە پیـت و بەرەکەتیـان هەیە هەنـدی چـاوت دەبینـی باشترین چا و قـاوەو شـەکری تێدایە، جۆرەها میـوەی تـازەو فـرێش بەردەسـتە، لە ڕووی گەشـتیارییەوە دەتـوانێ ببێـتە یەکەمـین سـەرچاوەی شـوێنی دونیا، ئەو جوانیـانەی لەوێ هەن لە کەم شـوێنی دونیـا دەبینـرێن، کەچـی کاتێـك دەچیـتە نـاو بـازاڕی گشــتی، ســەرت ســووڕدەمێنێت، پـیس و پـۆخڵی و هەژارییەك بە هیچ جۆرێك تەفسیر ناکرێتەوە، ژیان هێندە قورسە مـرۆڤ نازانێت ئەو مرۆڤانە پۆلان یان ئێسک و گۆشتن کە بەرگەی ئەو هەمـوو ئـازارە دەگـرن. کەواتە کێشـەکە بـوون و نەبـوونی سـامان نییە، خـوای گەورە ژیـانی هێنـدە بە دادگەری دابەشـکردووە، هەر شـوێنێکی بە جـۆرە سـەرچاوەیەکی سـامان دەوڵەمەنـد کـردووە، شـوێنێك بە (نەوت، ئـاژەڵ، زێـڕ، میـوە، گەشتیاری، ...)، بەڵکو کێشەکە لەو یاسا جێگیرەیە کە خوای گەورە دایناوە، ئەویش دادگەری و جوان هەڵسووراندنی سامانی وڵاتە. بـۆیە پێشـکەوتن و دواکەوتـن پەیوەنـدی بە ئەقڵییەتـی ئەوانە هەیە کە وڵاتەکە دەسووڕێنن، ئەگەر توانیـان دادگەری و عەدالەتێکـی جـوان بەرپا بـکەن، کـاری جددی بـۆ چارەسـەری گرفتەکان بکەن و بە حوکمێکی رەشید بەرەو پێش بچن ئەوا بەختەوەری دێـنن، بەپـێچەوانەوە وەکـو ئەفریقـا تەنیـا چینێکـی

کەمـی دیـاریکراو بـۆ خـۆی قـۆرخی دەکـات، بەڵام هـیچ کـاتێکیش ئاسـوودە نـین، هەمیشـە ترسـیان لە هەڵـگەڕانەوەی خەڵك هەیە، ئێستا ئەفریقیا هەمووی بووەتە میلیشیای چەتەیی کە هەر کەسێك ترسی پێگەیشتنی لێ بکەن یەکسەر لەرێگەی بۆدابـۆدا (ماتۆڕسکیل)ـێك تیـرۆری دەکەن، هونەرمەنـدێك لە یۆگەندا بۆتە ئۆپۆزسیۆن ئەوە چەندین جارە بە ئاشکرا هەوڵی تیرۆرکردنـی دەدرێـت. ئەمە بـۆ کوردسـتانی خۆشـمان هەروایە ئەگەر بڕیار بدەن حوکمێکی دادگەرو رەشید ئەنجام بدەن، خۆیان و تەواوی خەڵـك بەخـتەوەر دەبـن، بەپـێچەوانەوە ئەگەر خەریکـی نـاعەدالەتی بـن و خەڵکێـك بگەیەنـنە لـوتکەو خەڵکێکـیش نـان نەبێ بیخوات، یان نەتوانن سامانەکە بە دادگەری دابەش بکەن، ئەوا نە خەڵـك و نە حوکمڕانەکـانیش خێـرو خۆشـی لە خۆیـان نـابینن. ئەوە یاسایەکی جێگیری نەگۆڕی گەردوونیـیە، هـیچ جیاوازی لەنێوان مسوڵمانێك و کریستیانێك و بێ دینێك ناکات، بۆنموونە مسوڵمانێك ئەگەر نەتوانێت عەدالەتـی ئیسـلام بەرقەرار بکـات بـا هەر نـوێژ بکـات و مزگەوت بکـاتەوە هـیچ لە ژیـانی خەڵك ناگۆڕێت. قسـەیەك لە ئیمـامی غەزالـی و ئیـبن تەیمـیە دەگێـڕنەوە کە کـوفرو عەدالەت زیـاتر دەمێنـنەوە لە دیـن و ستەمکاری.

بە هەمـان شـێوە یاسـایەکی دیـکەی جێگیـر پەیوەنـدی بە

بواری نەخۆشییەوە هەیە، هەر وڵاتێك بتوانێت رێکاری پێشوەختە بگرێتەبەر کەمتر تووش دەبن و باجێکی کەمتریش دەدەن، کەچی ئەوانەی بە درەنگەوە بەخەبەردێن درەنگتر نەخۆشییەکە بنبڕدەکەن یا پێشکەوتووش بن. ئەوەی لە ڕووی پزیشکییەوە چارەسەری زووترو باشتر بدۆزێتەوەو بواری تەندروستی پێش بخات ئەوە نەخۆشەکانی زووتر چاك دەبنەوە. یان کەسێك بە جوانی و رێکوپێکی خواردن بخوات ئەوە زیاتر چێژ لە ژیان دەبینێت لە کەسێك هیچ گرنگی بە بواری خۆپارێزی و تەندرووستییەکی باش نادات و هەموو جۆرە خواردن و خواردنەوەیەك دەخوات و دەخواتەوە تا لەناکاوڕا بەکۆمەڵ نەخۆشی یەخەی دەگرن. ئەو وڵاتانەی تاقیکردنەوەی ترسناك ئەنجام دەدەن، ئەگەری نەخۆشی زیاتریان هەیە لەوانەی دوورەدەست لۆخۆیان لەگەڵ ژینگە دەست لە ملانێ دەژین. یان ئەوەی لە ڕووی پلان و زانستی سەربازییەوە پێشکەتوو بێت ئەگەری بردنەوەی شەڕەکەی زیارە لەوانەی لاوازترن. ئەم شتانە هیچ پەیوەندیان بە دینداری و بێدینییەوە نییە. هەروەها ئەوەی لە دووی گوناهـ بگەڕێت دەتوانێ بیکات ئەوی خۆشی بپارێزێت پارێزراو دەبێت.

ئەمانە هەموویان یاسای ژیانن خوای گەورە بۆ مرۆڤەکانی داناوە، دەفەرمووێت: ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا﴾ [الأحزاب الآية ٦٢].

واته: "هەرگیز گۆڕانکاری له یاساو بەرنامەکانی خوادا چنگ ناکەوێت".

کەواته: پێشکەوتن و دواکەوتن بە گوێرەی ئەم یاسا جێگیرانەیە کە خوا داینـاون، پەیوەندی بەوە نییە لە کامە ئایین و سەر بە کامە مەزەب و لە چ نەتەوەو لە کامە جوگرافیان. بۆنموونە وڵاتێکی مسوڵماننشین ئەگەر ئەو دادگەرییەی ئیسلام جێبەجێ نەکەن و لەگەڵ پێشکەوتنەکانی رۆژگار نەڕۆن و کێبڕکێی پێشکەوتنەکان نەکەن، ئەوە هەر بە پاشکەوتوویی دەمێننەوە، تەسکەرەو ناوی مسوڵمانێتی هیچ لە دۆخەکەیان ناگۆڕێت. خوای گەورە ئەوەی یەکلاییکردۆتەوە کە چاکە چاکەی دێتەڕێ و خراپەش خراپەی دێتەڕێ، دەفەرمووێت: ﴿لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا﴾ [النِّسَاء الآية ١٢٣].

واته: "پاداش و بەرزونزمکردن و بەڵێنەکانی خوا نە بە ئاوات و ئارەزووی ئێوەیە ئەی موسڵمانان! وە نە بە ئاوات و ئارەزووی خاوەن نامەکانیشە. هەر کەسێك هەرکارێکی نارەواو خراپ بکا، دڵنیا بن هەر بەو کارەی خۆیە جەزرەبە دەدرێ، بێجگە لەخوا هیچ چاودێرو یارمەتیدەرێکی دەست ناکەوێ بە هاواریەوە بێت"(١).

(١) تەفسیری رامان.

ئەم ئایەتە هێڵە گشتییەکانی ژیانی دونیاو ئاخیرەت دەستنیشان دەکات، خۆزگەخواردن هیچ داد نادات، بەڵکو گوێڕایەڵی یاساخواییەکانی گەردوون مەودای دۆڕان و سەرکەوتنت دەستنیشان دەکات، ئەو کەسانەی بیانەوێت لە دونیا یان لە ئاخیرەت بەرزببنەوە دەبێ کار بکەن، بە هەوڵ و کۆشش خەبات بکەن، کاری باشت کرد ئەوا پێشدەکەوی و ناوت دەچێتە ناو ناوان، کاری باشت نەکرد ئەگەر هەموو سامانی دونیا هی تۆ بێت و سەدان ناونیشانی (مسوڵمان، جوو، فەلە، بوزی، هیندۆس، سیخ، مارکسی، لیبراڵ، مولحید) هیچ لە واقیعی پێشکەوتنت ناگۆڕێت.

رۆژگارێك کە مسوڵمانان کاریان دەکرد ناویان لە پێشەوەی ناوان بوو، تا ئیستاش ناوی فەخرەدینی رازی لە پزیشکی و ئیبن خەلدون لە کۆمەڵناسی و دەیان ناوی دیکە لە سەرتاسەری دونیا دەشەکێنەوە. عەدالەتە وا لە دکتۆر (مایکڵ هارت)ی ئەمریکی دەکات ناوی ئیمامی عومەر لە ریزی (١٠٠) کەسی کاریگەری مێژوو تۆمار بکات، ئێستاش ئەوە پێشکەوتنە وای لە وڵاتێکی مسوڵمانی وەك مالیزیا کرد ناوی لە زبڵدانەوە بەرزبێتەوە بۆ ریزی ناوە بەرزەکان، ئەگەر بتوانێت دەست بە بەها بەرزەکانی پێشکەوتنەوە بگرێت بەرزتریش دەبێتەوە، ئەوە هەوڵ و تێکۆشانە وای لە (چین)ی شیوعی

کردووە ئەمریکاو ئەوروپای هەژاندووە لە ترسی ئەوەی رێبەرێتی دنیایـان لـێ بسـتێنێتەوە، ئەوە پێشـکەوتنە ئەمریکـاو ئەوروپـای مەسیحی بەرزکردۆتەوە، کەواتە چی بچینی ئەوە دەدووریـیەوە جا چ بۆ دونیـا بێـت یـان ئـاخیرەت. شارسـتانی ئیسـلام ئەگەر مسـوڵمانان ئیشـی پێـبکەن لە یەك کاتـدا دونیـاو ئـاخیرەت دەبەسـتێتەوە، بەڵام ئەگەر تەمـبەڵ و تەوەزەل بـن و خەریکـی ژەمی گەورەو پاڵدانەوەو ناودەکردن بن، ئەوە ناوی مسوڵمانێتی هـیچ دادیـان نـادات، هەرکە توانیـان دەسـت بە (زەنگینـی، برایەتی، زانست) بگرن ئەوە بە ئاسانی رێبەرێتی دونیا دەگرنە دەست، ئەگینا هیچ.

کەواتە خـوای گەورە دوو جـۆر شـێوازی یاسـای نەگـۆڕی داناوە: ئەو یاسا نەگۆڕانەی گەردوونیان پێوە دەسووڕێت. لەگەڵ ئەو یاسا نەگۆڕانەی ژیانی رۆژانەی مرۆڤەکانی لەسەر بەندە لە هاتنی نەخۆشی و چارەسەرو خۆشی و ناخۆشی، رزگاربوون لە ژێردەستەیی و سەرکەفتن و دۆڕان، پێشکەوتن و دواکەوتن. کە هەموویان بە کۆمەڵێك یاساوە بەندن.

لە لاپەڕەکانی دابێ زیاتر دەچینەوە سەر ئەو بابەتە.

•

## ئەم ڕێسا نەگۆڕانە بۆچی؟

ئەم ڕێسایانە نەگۆڕو جێگیرن، تەنیا بۆ پێغەمبەران گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، وەك: (نەسووتاندنی ئاگر بۆ حەزرەتی ئیبراهیم)، (شەقبوونی دەریا بۆ حەزرەتی موسا)، بەڵام ئەوە تایبەتە بە پێغەمبەران، ئەوانیش بە بەردەوامی نییە، بەڵکو تەنیا بۆ سەلماندنی پەیامەکەیانە تا هیچ هەنجەتێك بە دەست خەڵکەوە نەمێنێت لە باوەڕنەهێنان. ئەگینا ئەوانە نە گۆڕانیان بەسەردا دێت و نە لەکاریش دەکەون.

پرسیارەکە ئەوەیە: ئێستا دەبینین لە ژیاندا چەندان ناخۆشی و نەهامەتی گەورە روودەدەن، وەك ئەوەی لافاوێك هەڵدەستێت هەزاران کەس دەکاتە قوربانی، ئاگرێك دەکەوێتەوە دنیایەك دەسووتێنێت، ئەوە راستە کە بەگوێرەی یاسای خوایی ئاگر سووتێنەرەو مرۆڤەکان دەیکەنەوە، بەڵام ئایا باشتر نییە خوای گەورە خۆی بێتە ناو بابەتەکەو لافاوەکە رابگرێت، یان کاتێك شەڕو ناخۆشی دەکەوێتە نێوان خەڵکێکی دیندارو بێدین باشتر وانییە خودا هاوکاری دیندارەکان بکات.

بۆنموونە: بۆچی دەبێ رووسیای شیوعی بەسەر مسوڵمانەکان سەرکەوێت، بۆچی خوای گەورە رێگایان لێناگرێت، یان کە دەردو نەخۆشییەك بڵاودەبێتەوە، بۆچی خودا

ئیماندارانی ناپارێزێت بەوەی راستەوخۆ نەهێڵێ ئەو نەخۆشیانە بکەونە ناو مسوڵمانان، کەچی دەبینین لە پەتای (تاعونی عیمواس)دا چەندان لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بە هاوشانی مسوڵمانەکانی دیکە دەبنە قوربانی؟

وەکو مسوڵمان پێمان وایە خوای گەورە یاساکانی بەم شێوە نەگۆڕە داناون و بۆ هیچ کەسیشی ناگۆڕێت، کۆمەڵە حیکمەتێکی لە پشتەوەیە، کە هەندێکیان باس دەکەین، دەکرێ هی دیکەش هەبن:

**یەکەم: خواناسین:**

دەربارەی یاسا نەگۆڕەکانی گەردوون، خوای گەورە کاتێك بەم وردییەوە دایناون یەکەمین هەنگاوە بۆ ناسینی خوای بەدیهێنەر، ﴿سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ﴾ [فُصِلَت الآية ٥٣].

واتە: "ئێمە لە ئایندەدا بەڵگە و نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی بوونەوەرداو لە خودی خۆیشیاندا ئەمەش بۆ ئەوەی تا چک بۆیان ڕوون بێت و دڵنیابن کە ئەو زاتە حەق و ڕاست و ڕەوایە".

بۆنموونە: عەمر شەریف نموونەیەکی زانایان دێنێتەوە: "ئەگەر ئەندازەی هێزی کێشکردن کە خولگەکان بە یەکەوە

گرێـدەدات لە ئەنـدازەی ئێسـتا زیـاتر بـواتە، ئەوا گەردوون بەرلەوەی ژیانی تێدا دروست ببێت بەسەرخۆیدا دەڕووخا. ئەگەر لە ئەندازەی ئێستاش بێهێزتر بوایە، ئەوا گەلەستێرەو ئەستێرەکان درووسـت نەدەبـوون. هێـزی کێشـکردن بە وردی رێکخـراوە، کە (۱:۱۰۰،۰۰۰) تێـدەپەڕێنێت. ئەگەر زەوی ئەوەنـدەی مانـگ بـوایە، ئەوا هێـزی کێشـکردنەکەی یەك لەسـەر شەشـی هێـزی کێشکردنەکەی ئێستای دەبوو، نەیدەتوانی هەڵمی ئاو و هەوای دەوری دەسـتپێوە بگرێـت، واتە بەرگە هەوا هەڵدەوەشـا، ئەمەش لەسەری پێویست دەکات کە بە شەو ساردی زیـاتر ببێت بـۆ ئەوەی هەرچـی لەسـەر زەوی هەیە بیبەسـتێت، بە رۆژ گەرمییەکەی زیاتر ببێت و هەرچی لەسەریەتی بسووتێت (وەك ئەوەی لەسەر مانـگ روودەدات، کە هیچ بەرگە هەوایەکی لە دەوردا نامێنێت".

جـا کاتێـك دەبینـین گەردوون بەم سیسـتەمە وردە دەڕوات لە پەیوەنـدی نێـوان بچـووکترین بـوونەوەر تـا گەورەتـرین شـت ئەوە تێـدەگەین خـوایەکی دروسـتکاری حەکیمـی لە پشـتەوەیە. بەپـێچەوانەوە ئەگەر بەشـێوەی فەوزا بـوایە قەت لەرێـگەی ئەوانەوە بەرەو خوداناسین نەدەچووین. ئێستا کە دەبینین گەردوون بەم وردی دیزاینە دروستکراوە دەزانین یان لە رێگەی رێکەوتەوە دروست بووە یـان نەخشی دەستی پەروەردیگـارە، سەبارەت بەوەی

ڕێکەوت بێت ئەوە هیچ ئاقڵێك ڕێگە بەوە نادات نە سووکایەتی بە ئەقڵی خۆیی و نە بە ئەقڵی کەسانی بەرامبەر بکات و هەوڵی قەناعەتهێنانی ئەوە بدات کە بەرهەمی ڕێکەوت بێت.

بۆنموونە: (دکتۆر سەعید ڕەمەزان بۆتی) باس لەوە دەکات کاتێك تۆ دەچێتە مۆڵێك دەبینی دەرگای سەرەکی مۆڵەکە لەگەڵ نزیکبوونەوەی تۆ دەکرێتەوە، لە دوای تۆش یەکسەر دادەخرێت، جا ئەگەر تەنیا یەکجار حاڵەتێکی وەها ڕوویدات ئەوە ئاساییە پێت وابێت بە ڕێکەوت کراوەو داخرا، بەڵام کە دەبینی هەمیشەو بۆ هەموو کەسێك وەهایە، ئەوە گەمژەییە حاشا لە کارامەیی ئەو وەستایە بکەیت کە دروستی کردووە، هەم گاڵتە بەخۆکردنیشە، بۆیە گەردوونیش کاتێك (بەردەوام) بەو یاسا وردانە بەڕێوە دەچێت، ئەوپەڕی گەمژەییە کەسێك وابزانێ بە ڕێکەوت دروست بووە.

**دووەم: پێغەمبەرناسین:**

یەکەمین هەست و ئەرکی دوای خوداناسین، هەستکردنە بە بەرپرسیارێتی جێبەجێکردنی فەرمانەکانی ئەو خوایە.

پێویستە ڕێگایەك هەبێت بۆ ناسینی فەرمان و نایەکانی ئەو خودایە لەپێناوی هەڵستان بە ئەرکی بەندایەتی، بەپێچەوانەوە ئەگەر ئەو ڕێگایە نەبێت مرۆڤەکان سەرگەردان دەبن و نازانن چۆن مامەڵە بکەن، بۆنموونە چەندان کەسانی

بێباوەڕو مولحید دوای تێڕامان و قووڵبوونەوە باوەڕیان بە خودا هێنا، بەڵام لەبەرئەوەی باوەڕیان بە هیچ پێغەمبەران نەهێنا تا مردنیش نەیانزانی ئەرکی بەندایەتی مرۆڤ چییە بەرامبەر بەو خودایە. جا بۆئەوەی لەو گێژەڵووکە رزگاریان بێت پێویستە پێغەمبەرانی خودا بناسن ئینجا بەگوێرەی فەرمان و رێنماییەکانیان ئەرکی سەرشانیان راپەڕێنین، ئەمەش تەنیا لەرێگەی پێغەمبەرانەوە دەبێت.

بەڵام ناسینی پێغەمبەرانیش هێندە ئاسان نییە، چونکە پێغەمبەری راستەقینەو کەسانی درۆزنیش هەن بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن، پێویستە رێگایەك هەبێت بۆ هاوێرکردنی راستگۆو درۆزنەکە، تاکە رێگەی ناسینی راستەوخۆی پێغەمبەران ئەو یاسا نەگۆڕانەیە.

واتە :کاتێك هیچ کەسێك ناتوانێت ئەم یاسایانە بشکێنێت، کەچی کەسێك یاساکانی لە بوارێکدا شکاندوونە کارێکی پێچەوانەی یاسا جێگیرەکان کردووە بەڵگەیە ئەوە پێغەمبەرەو لە خواوە هاتووە، بە بەڵگەی ئەو نیشانە گەورەی کە توانی ئەو رێسا نەگۆڕانە تێپەڕێنێت.

خوای گەورە دەربارەی حەزرەتی موسا (ﷺ) دەفەرمووێت: ﴿وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ فِي تِسْعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿١٢﴾﴾ [النمل الآية ١٢]. واتە:

"جا دەستەکەت بخەرە گیرفانتەوە، هەر کە دەرتهێنا بە سپییەکی بێ عەیب دێتە دەرەوە، ئەم دوو (موعجیزە)یە لە ریزی نۆ (موعجیزە) دایە بۆ فیرعەون و قەومەکەی، بەڕاستی ئەوانە قەومێکی لە سنوور دەرچوو بوون".

لێرەوە فیرعەون سنوورەکان دەبەزێنێت، خەڵك دەکاتە کۆیلەی خۆی، ئینجا خوای گەورە پێغەمبەرێکی دەنێرێت تا سنوورێك بۆ زوڵم و ستەمەکەی دانێت، کە دەست بە بانگەوازەکەی دەکات، هەم فیرعەون گاڵتەی پێ دێت هەم خەڵکیش باوەڕی پێناکەن، بەڵام حەزرەتی موسا (ﷺ) بەڵگەی یەکلاکەرەوەی لەلایەن خواوە پێیەو بە رووی فیرعەونی دادەدات، ئەو بەڵگانەی لە توانای هیچ مرۆڤێکدا نینە. ساحیرەکان دەیانزانی ئەو کارەی موسا (ﷺ) کردی، بەدەرە لە سیحرو جادووگەری، شەقبوونی دەریا کاری هیچ مرۆڤێك نییە، لەم رێگەوە زانیان ئەوانە پێغەمبەرن، ئەگینا نەیاندەتوانی یاسا نەگۆڕەکان تێپەڕێنن. بەم جۆرە پێغەمبەری راستەقینەیان ناسی.

## سێیەم: هاوسەنگی یاسای ژیان:

ئیمامی رازی دەربارەی ئەو رووداوانەی روودەدەن و هیچ پەیوەندی بە مرۆڤەوە نییە، قسەیەکی جوانی قازی عەیاز نەقڵ دەکات، کە "دەبێ مرۆڤی مسوڵمان لە ئاست ئەم رووداوانە باوەڕی وابێت کە حیکمەت و راستی و دادگەری و چاکەو

خێرێکی تێدایە، پێویستە واز لە نووزە نووز بێنین و بەدۆخەکە رازی بین".

هەندێك لەو رووداوانە لەوانەیە مرۆڤ بە کاری خراپیان بزانێت بەڵام لە خودی خۆیان خراپ نین، بەڵام ئەقڵی هەموو مرۆڤێك درك بە لایەنە باشەکانی ناکات، بۆنموونە دروستبوونی بورکان و بوومەلەرزە هەندێکجار لە شوێنی وا روودەدات کە هیچ ئاوەدانی مرۆڤی لێ نییە، یان ئەگەر مرۆڤیشی لێ بێت، ئەوە دەرەنجامی چەند یاسایەکی فیزیائییەو لە خودی خۆیدا خراپ نییە، هۆکارێکی سەرەکی ئامادەسازی زەمینن بۆ ژیان، لە رێگەیانەوە وزەی خەزنکراو لە ناو زەوی دەدەنەوە، جۆرەها سامانی کانزایی فرێ دەداتە سەر زەمین و مرۆڤ لێیانەوە سوودمەند دەبێت، زۆربەی ئەم سوودانە لەگەڵ پێشکەوتنی زانستی دەردەکەون، لەوانەیە جۆرە سوودێکی هەبێت مرۆڤی پێشوو هیچی دەربارە نەزانیبێت، مرۆڤی ئێستا سوودەکەی دەزانێت، ئەو بەراوردە بۆ داهاتووش بە هەمان شێوەیە.

**چوارەم: دەرخستنی خۆشییەکان:**

سەبارەت بە هەندێك یاسای وەك ئازارو ناخۆشی و دەردو بەڵایەکان، زانایان پێیان وایە خۆشی و ناخۆشی دوو رووی دراوێکن، هیچ یەکێکیان بەبێ ئەوەی دیکە نابن، بەتایبەتی زانایانی بواری رەوشت ئەمە بە کارێکی حەتمی ئەخلاق دەزانن،

چونکە بەبێ بوونی ناخۆشی مەحاڵە جوانی فەزیلەت و ئەخلاق دەرکەوێت، بۆنموونە ئەگەر سووکایەتیپێکردن نەبێت لێبووردنیش نابێت، ئەگەر ناخۆشی و ستەمکاری نەبێت بەهاناوەچوون هیچ مانایەکی نیە. خۆشەویستی دروست نابێت بەبێ بوونی هەستی سۆزو بەپیرەوەچوون و قوربانیدان.

ئەگەر مەینەتییەکانی ژێردەستەیی نەبوونا قەت چێژمان لە ئازادی وەرنەدەگرت. بۆیە دەبێ ناخۆشی و چەرمەسەرییەك هەبێت تا بگەینە فەزیلەت و گەورەیی (زاڵبوون بەسەریدا)، بەمەش ناخۆشییەکان پردی گەیشتنە خۆشییەکانن، شتانێك هەن مرۆ زۆری پێناخۆشە، لە دواوەی خێرو بێرێکی گەورە هەیە.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُواْ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ٢١٦﴾ [البَقَرَة الآية ٢١٦]. واتە: "جەنگ لەسەرتان بڕیار دراوە کە شتێکی گرانە لاتان، بەڵام لەوانەیە شتێکتان لا ناخۆش بێت کەچی خێر لەوەدا بێت، هەروەها لەوانەیە شتێکتان پێ خۆش بێت کەچی شەڕ لەوەدا بێت، بێگومان هەر خوا خۆی دەزانێت (خێر لە چیدایە)، ئێوە نایزانن".

بەگوێرەی ئەم بڕگەیە خۆشی و جوانییەکان بەبێ بوونی

ناخۆشی و قێزەونییەکان دەرناکەون. بۆیە یاسای ژیان وەهایە دەبێ ئەو دەردانە هەبن تا بەو خۆشیانە بگەین، ئەگینا هیچ لە مانای خۆشییەکان تێنەدەگەیشتین.

**پێنجەم: ویستی چاکەو داهێنان:**

مرۆڤ بە جۆرێکە هەموو کات لە داهێنانی تازەو نوێ دایە. ئەوە بە تەواوی وابەستەی ئازارو مەینەتییەکانە، بە گەڕانەوە بۆ مێژووی مرۆڤایەتی، دەردەکەوێت ئەو پێشکەوتنانەی هەیەتی، دەرەنجامی پێویستی و ئازارو ناخۆشی بوونە. ئەگەر کۆنترۆڵی ئامێرە ئەلتکرۆنییەکان وەك نموونەیەکی بەردەست بێنینەوە، ئەگەر مرۆڤ ئازاری بە گۆڕینی دەست نەدیتبا قەت کۆنترۆڵی دانەدەهێنا، بەڵام کاتێك تەلەفزیۆن بووە زیاد لە کەناڵێك، گۆڕینی یەکێکیان بۆ یەکێکی دیکە هەموو جارێ پێویستی بە هەڵستان هەبوو، ئەمەش هەم تاقەت و هەم کاتی دەویست، لەوانەشە دوو رووداوی جیاواز لە یەك کاتدا لەسەر تیڤی هەبن کەسەکە حەز بکات زوو زوو بۆ هەردووکیان بگۆڕێت، ئەوە تەنیا بە کۆنترۆڵ چارەسەرکرا.

بە هەمان شێوە ئەگەر ئازاری گەرما نەبوایە قەت سپلیت و ساردکەرەوەی ناو ترومبێل دانەدەهێنران، هەر بۆنموونە لە ولاتێکی وەکو یۆگەندا نە ساردکەرەوەو نە گەرمکەرەوەیان نییە، چونکە کەوتۆتە سەر هێڵی ناوەڕاست (equator) نە ساردی و نە گەرمیان ناگاتێ. لە هەندێك ولاتی ساردی ئەورووپا تەنیا گرنگی بە گەرمکەرەوە دەدەن. ئەوە بۆ هەموو بوارەکانی

دیکەش، خۆ ئەگەر ترسی فڕۆکە نەبوایە دژە فڕۆکە دروست نەدەکرا.

بۆیە مرۆڤ کە بوونەوەرێکی جیاوازە لە رووی کۆمەڵایەتی و ئەقڵییەوە هەمیشە عەودالی پێشکەوتن و داهێنانە. ئەگەر ئازارو ماندوبوون نەبوایە قەت بە رۆژگاری ئەمڕۆ نەدەگەیشت.

کەواتە: بوونی ئازار سەرچاوەی پێشکەوتنی مرۆڤە. خوای گەورە یاساکانی ژیانی بە هاوسەنگی نێوان خۆشی و ناخۆشی داناوە، تا مرۆڤ بتوانێ لەگەڵ ناخۆشییەکان داهێنانی تازە بێنێتە ئاراوە، بەپێچەوانەوە لە سنوورێك دەوەستا.

**شەشەم: پاراستنی شکۆی مرۆڤ:**

خوای گەورە مرۆڤی کردۆتە سەرداری ئەم زەمینە، هەرچی هەیە ژێردەستی ئەوی کردووە، بەهۆی ئەقڵەوە لە هەموو بوونەوەرانی دیکەی جیاکردۆتەوە. بەو ئەقڵە ئیرادەی چاکەو خراپە دەکات، گۆرانکاری لە زەمیندا دەکات.

ئەو ئیرادەو ئەقڵە گەورەترین بەخششە خوای گەورە داویەتییە مرۆڤ، جا بۆئەوەی ئەم حاڵەتە دەرکەوێت ئەم ڕێسا نەگۆڕانەی پێبەخشیون.

بینە بەرچاوی خۆت، ئەگەر ژیانی دونیا بەم یاسا جێگیرانە

نەبوایە چ گرنگییەك بۆ مرۆڤ دەماوە، بۆنموونە هەرچی ناخۆشییە نێتە سەرت، هەرچی ئازارە نەبینی، چۆنی بتەوێت ژیان وابێت، تەنیا دەسەڵاتی چاکەت هەبێت، ئایا هیچ گرنگیەك بۆ تۆ دەمێنێتەوە؟

گەورەیی تۆ لەوەدایە ئازادییەکت هەیە کە لە یەك کاتدا دەتوانی چاکە بکەیی و خراپەش بکەی، یاساکان جێگیرن، تۆش بەو ئازادییەوە دەتوانی مامەڵەی دروست لەگەڵ ئەو رووداوانە بکەی، دەتوانی لە جوانڕاییکردنی سامانی وڵات و چەسپاندنی دادگەری بەختەوەری بۆ گەلەکەت مسۆگەر بکەی.

لەولاوەش کەسێکی دیکە هەیە بەپێچەوانەوە هیچ سوودی لێ وەرناگرێت. تەندروستی خۆت بپارێزە لە نەخۆشی دوور دەبیت، مەیپارێزە تووشی نەخۆشی دەبی و لەوانەیە خەڵکی دیکەش تووش بکەی. گەورەیی تۆ ئا لێرەوە بەدیاردەکەوێت، بەبێ بوونی ئەو ئازادی و ئیرادەیە لەناو ئەو یاسا چەسپاوانە، رۆبۆتێک دەبووی بەبێ ویستی خۆت بەرەو کاری باش دەبرای، نە چێژت لە خۆشییەکان وەردەگرت، نە گەورەییشت بەدیاردەکەوت.

**حەوتەم: تاقیکردنەوەی دونیایی و ئاخیرەت:**

ئەمە هەر تەواوکەری خاڵی پێشەوەیە، واتە ئەگەر یاساکانی دونیا جێگیر نەبوونا، نە تاقیکردنەوەی دونیاو نە تاقیکردنەوەی ئاخیرەت هیچ مانایەکی نەدەما.

بۆنموونە: تۆ قوتابیەکانت تاقی دەکەیەوە، یان فەرمانبەرەکانت تاقیدەکەیەوە، یان لە رێگەی هەڵبژاردنەوە سەرۆکێك تاقی دەکەیەوە. ئەو کاتە دەتوانی کەسانی سەرکەوتوو لە دۆڕاو و فاشیلەکان جیابکەیەوە، کە چانسەکان بۆ هەموویان یەکسان بن، ناتوانی هەڵسەنگاندن لەنێوان دوو کەس بکەی، یەکێك هەموو شتی بۆ فەراهەم بکرێت و یەکێکیش هیچی نەبێت.

ئا لێرەوە دەبینین یاساکانی گەردوون و ژیان جێگیرن و بۆ هەموومان وەکو یەکن، کەسێك بە ویست و ئیرادە و ئەقڵی خۆی خزمەتی جوانتر پێشکەش دەکات ئەوە سەردەکەوێ.

ئەوەی دی کە ئاگاتە ئەو ئاستە دەدۆڕێ، خۆ ئەگەر یاساکان چەسپاو نەبوونایە، تاقیکردنەوەکە هیچ مانایەکی نەدەما، بۆ قیامەتیش هەروا، دەرفەتی پێغەمبەرناسین بە بەڵگەوە لەپێش ئیمامی ئەبوبەکرو ئەبو جەهل وەکو یەك بوو، بەڵام یەکەمیان ئەقڵی هەڵبژاردو لە تاقیکردنەوەکە دەرچوو.

کەچی دووەمیان نەفس و دەروونی زاڵ بوو بەسەر ئەقڵدا، لە تاقیکردنەوەکە دۆڕا. دوو گەنجی ئەم سەردەمە بەهەمان شێوە بکە نموونە، هەردووکیان دەتوانن داوێنپیسی و قومار بکەن، جا یەکێکیان ئەنجامدانی کارەکە هەڵدەبژێرێت و ئەوەی دیکە خۆپاراستن.

لێرە تاقیکردنەوەکە یەکلایی دەبێتەوە، خۆ ئەگەر چاکەکاری ناچاری بوایە، هەردووکیان فریشتە ئاسا بەس چاکەیان لە دەست هاتباو توانای خراپەیان نەبا، تاقیکردنەوەکە هیچ ئەنجامێکی نابوو.

**هەشتەم: ڕەوشتناسی:**

ئەوەش لەناو بەشێك لە خاڵەکانی پێشتر باسکراوە، بێگومان مرۆڤ بوونەوەرێکی خاوەن رەوشت و ئەخلاقە، بەڵام رەوشت بەبێ نەگۆڕی یاساکان هیچ مانایەکی نەدەبوو.

بۆنموونە: قوربانیدان و هاوکاریکردن و بەهاناوەچوون چەند سیفەتێکی جوانی رەوشتە، ئەوە تەنیا لەرێگەی ئازادی ناو رووداوە جێگیرەکان دەردەکەوێت.

بۆیە کاتێك نەخۆشییەکی کوشندە یەخەی مرۆڤایەتی دەگرێت، هەژاری و نەداری روودەکاتە خەڵك، ژیان تاڵ دەبێت، کەسێك هەیە ماڵ دەبەخشێت، باڵەخانەکانی دەکاتە نەخۆشخانە، نرخی بازاڕ رادەگرێت.

لە بەرامبەردا کەسێك ئازاری خەڵك دەکاتە پردی خۆپێگەیاندن و دەوڵەمەندبوون، باکی بەوە نییە خەڵك چی بەسەر دێت.

ئەوەی یەکەم بە خاوەن رەوشتی بەرزو ئەوەی دووەم بە رەوشت قێزەون وەسف دەکرێن. ئەگەر ناخۆشییەکان و ئازارەکان و یەکسانی چانسەکان نەبوایە هیچمان دەربارەی ئەو رەوشتانە نەدەزانی.

**نۆیەم: ئـــــازادی:**

گەورەتـرین سـیفاتێك مـرۆڤ جیـا لە هەمـوو بوونەوەرەکـانی سەر زەمین هەیەتی بریتییە لە ئازادی، ئەم خاڵە بناغەی هەموو خاڵەکانی رابردووە. خوای گەورە ژیانی لەسەر چەند یاسایەکی نەگۆڕ بە مرۆڤ بەخشیوە، ئینجا ئازادیشی کردووە.

بەڵام ئەگەر پێمان وابێت دەبێ خوا ناچارمـان بکـات کـاری چاکە ئەنجام بدەین، گەورەترین سووکایەتی بە مرۆڤ دەکەیـن، چـونکە ئەو کـاتی گەورەتـرین سـیفاتی تایبەتمەنـدی لـێ دەستێنینەوە کە ئازادییە.

ئـازادی لەو کـاتەدا فەراهەم دەبێت کە یاسـاکان بەجێگیـری لەپـێش تاکەکـانەوە بـن و بە ئـازادی خۆیـانەوە یەکێکیـان هەڵبژێرن.

**دەیەم: گەڕانەوە:**

ناخۆشـی و بەڵایەکـان دەروازەیەکـن بـۆ گەڕانەوە، گەڕانەوە دوو جۆری هەیە:

**یەکەم:** گەڕانەوە بۆ لای پەروەردیگار. خوای گەورە مرۆڤی بە ئەقڵێکـی جـوان دروسـتکردووە، هەروەهـا پێغەمبەرانیشـی بـۆ ناردوون تا رێگای راستیان پیشان بدەن.

هەروەهـا مرۆڤیشـی نەکـردۆتە مـاکینەیەکی بـێ هەسـت

ناچار بە باوەڕ بکرێت، بەڵکو دەروازەی چاکەو خراپەی بۆ کردۆتەوەو ڕێگاکەی پیشانداوە. بەڵام مرۆڤ زۆر جاران دەبێتە کۆیلەی ئارەزووەکانی، لەوانەیە برادەرێك یان ماڵ و سامانێك یان هەر کارێك بیباتە دۆخێك قەت خوای وەبیرنێتەوە، ئا لێرەدا مرۆڤ کاتێك راستییە ڕیکوپێکەکانی گەردوونی بۆ دەردەکەون، یان لەرێگەی نەخۆشی و جۆرە ئازارێکەوە لاوازی خۆی بۆ دەردەکەوێت، یەکسەر دەگەڕێتەوە لای خواو لە هەڵەکانی بەرامبەر خواو خەڵك پەشیمان دەبێتەوە.

لەوەوە تێدەگەین ئەو شتەی بە ناخۆشی دەزاندرا، بەخششێکی گەورە بوو. کەسی واش هەیە بەپێچەوانەوە خوای گەورە بە (خۆشی) تاقی دەکاتەوە، جا کاتێك ماڵێکی زۆری چنگ دەکەوێت، یان بێ منداڵەو منداڵی پێ دەبەخشرێ، یان بڕوانامەیەك وەدەست دێنێت، یان چەندان خۆشی دیکە هەن، یەکسەر سەری بەندایەتی بۆ خوا نەوی دەکات و لە دڵیدا دەڵێت: (خوایە تۆ ئەو هەموو چاکەیەت لەگەڵدا کردوومە، خوایە تۆبەو پەشیمانی بەردەم قاپی تۆم). خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَبَلَوْنَٰهُم بِٱلْحَسَنَٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ [الأعراف الآية ١٦٨].

واتە: "بەچەندەها خۆشی و ناخۆشی تاقیمان کردنەوە بۆ ئەوەی ئەوان بگەڕێنەوە (بۆ ڕێبازی ڕاست و دروست)".

کەواتە: خۆشیو ناخۆشی دەروازەی گەڕانەوەن بۆ لای خودا.

**دووەم:** گەڕانەوە لە کـــارە خـــراپەکە. واتە مەرج نیـــیە گەڕانەوەکە بـــۆلای خـــوا بێـــت، بەڵکـــو خەڵـکەکە لە کـارە قێزەونەکەیان دەگەڕێنەوە کە بووەتە هۆی ناخۆشییەکە.

بۆنمـوونە: کاتێـك ڤایرۆسـی کۆڕۆنـا بڵاوبـوویەوە رێـژەی ئەوانەی دەســـتەکانیان دەشـــۆن دوای چـــوونە مەراحـــی و تارەتگرتن، مایەی شۆك بوون، ئاخر رێژەی هەرەزۆری خەڵکی دونیـــا نە دەســـتیان دەشـــۆن و نە ئـــاویش بەکـــاردێنن، ئەمەش هۆکارێکە بۆ بڵاوبوونەوەی نەخۆشی، یان (وەك دەگوترێت) ئەو ڤایرۆسە پیلانێك بێت و بە ئەنقەست گوازرابێتەوە.

جا بەم هەڵسوکەوتەیان، تووشی نەخۆشی دەبن بۆئەوەی لەو کارانە بگەڕێنەوە هەرچەندە تۆبەی باوەڕ بە خواش نەکەن.

**یازدەم: لێخۆشبوونی گوناهـ**

لایەنێکـــی دیـــکەی ئـــازارو نەخۆشـــییەکان بـــۆئەوەیە لە گوناهەکانیـان خـۆش بێـت. مرۆڤـی بـاوەڕدار هەر نەخۆشـی و بەڵایەك بێتە سەری گوناهەکانی هەڵدەوەرێن.

**دوازدەهەم: سزادانی تاوانباران.**

قورئـان بە روونـی ئامـاژە بەوە دەکـات، هەنـدێك لەو رووداوانە وەکـو سـزای خـودا هـاتوون بـۆ ئەو ئوممەتـانەی گوێیـان بە بەڵگەکان نەداوەو پێغەمبەرانیان بەدرۆزانیون و ستەمیان کـردووە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ

قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ [الرُّوم الآية ٤٧].

واتە: "بەڕاستی پێش تۆ (ئەی محمد صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەرانێکمان ڕەوانە کردووە، بۆ سەر هۆزو گەلەکانیان، بەڵگەو نیشانەی زۆریان بۆ هێنان، بەڵام زۆریان باوەڕیان نەهێنا، بۆیە ئێمەش تۆڵەمان سەند لەوانەی کە تاوانیان کرد، ئەوسا ئیتر سەر خستنی ئیمانداران بە ئەرکی سەرشانی خۆمان زانی و سەرکەوتنمان پێ بەخشین".

**سێزدەهەم: پاداشتکردنەوە.**

حیکمەتێکی دیکەی ئازارو بەڵاو ناخۆشییەکان بەرزکردنەوەی پلەو پایەی باوەڕدارانە، چونکە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ژیانی دونیا تەنیا ڕێچکەیەکە بەرەو ئاخیرەت، بۆیە بەهیچ شێوەیەك ژیانێکی کاتی لەگەڵ ژیانی یەکجارەکی بەراورد ناکرێت، مسوڵمانان ئاقیدەمان وایە خوای گەورە بەو ناخۆشی و بەڵایانە پلەمان بەرزدەکاتەوەو پاداشتی زیاترمان دەداتەوە، هەربۆیەش کاتێك ڕووداوێکمان بەسەر دێت ئەگەر هەڵەی دەستی خۆمانی تێدا بێت بەخۆدادەچینەوە، لە هەمان کاتدا ئارام دەگرین، چونکە دەزانین پاداشت دەکرێینەوە.

بەڵام لەوەدا ڕاستکردنەوەیەك پێویستە، کەسانێك واتێدەگەن

دەردو بەڵا بۆ باوەڕدار رەحمەتەو بۆ بێباوەڕانیش عەزاب، ئەو فەرموودەیە لە دایکە عائیشە دەگێڕنەوە، بەڵام مانای ئەوە نییە باوەڕدارەکە ئازار ناچێژێت یان بە شتێکی خۆش و باشی دەزانێت و خۆی ناپارێزێت و چارەسەر وەرناگرێت، بەڵکو بۆ هەردووکیان وەکو یەك ئازارو مەینەتی دێنێتەوە.

لەوانەیە باوەڕدارەکە ئازاری زیاتریش بچێژێت. مانای فەرموودەکە لە ئەنجامەکەیە، کە هەردووکیان وەکو یەك دەناڵێنن، بەڵام لەبەرئەوەی باوەڕدار باوەڕی بە خوا هەیە، وێڕای خۆپاراستن و دۆزینەوەی چارەسەرو گەڕانەوە لە کەمتەرخەمی و هەڵەکەی، ئارامدەگرێت و بە تاقیکردنەوەی خوایی دەزانێت، پشتی بە خوا دەبەستێت.

لە بەرامبەر ئەو باوەڕو پشتبەستنی بەخوا، پاداشت دەکرێتەوەو هەموو هەناسەو ماندوبوونی بۆ بەچاکەو دەنووسرێت. بەڵام کابرای بێباوەڕ بڕوای بە قیامەت و هەڵستانەوەو خوا نەبووە، پشتی پێنەبەستووە، بە تاقیکردنەوەی نەزانیوە، بۆیە نە بۆ لای خوا دەگەڕێتەوەو نە پشتی پێ دەبەستێت و نە بەناوی باوەڕو تاقیکردنەوە ئارام دەگرێت.

بۆیە هیچ خێری قیامەتی لێ نابینێت، ئەگینا هەردووکیان ئازار دەچێژن و هەردووکیشیان پێویستیان بە گرتنەبەری رێکارەکان هەیە.

ئەوانە بەشـــێك بـــوون لە دەرەنجـــام و حیکمەتەکـــانی یاسانەگۆڕەکان.

## بەلاو کارەساتەکان:

وێـــڕای ئەوەی ئەو هەمـــوو ڕێکـــوپێکییە لە یاســـا گەردوونییەکان هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك بەلاو موسیبەتی گەورە بەسـەر مرۆڤـایەتی دێـن، کە زۆر جـاران وڵاتێـك یـان دەڤەرێك وێران و خاپوور دەکەن، وەکو کارەساتەکانی بورکـان و لافاوو بـومەلەرزەو پەتـاو نەخۆشـییە گوزراوەکـانی وەك کۆرۆنـاو تاعوون، ئەم کارەساتانە دوو جۆریان هەیە:

### یەکەم: کارەساتە سرووشتییەکان.

ئەوانەی هـیچ دەسـتی مرۆڤـیان تێـدا نیـیە وەك بـوومەلەرزەو بورکان و تسۆنامی و... ئەوانە خەڵکێکی زۆر دەبێتە قوربانیـان وەك ئەوەی لە ئیندۆنیسـیا ڕوویـدا یـان سـالانە لە ئەمەریکـاو شـوێنەکانی دیـکە ڕوودەدات، یـان ئەو بـوومەلەرزەی پارسـاڵ لە ئێران هـات، هەروەهـا لە یەك بـوومەلەرزە لە تورکیـا (٣٠,٠٠٠) کەس بـــوونە قوربـــانی. ئەوانە کارەســـاتیگەلێکن لە دەرەوەی توانای مرۆڤن واتە نە مرۆڤ هۆکاریانەو نە دەشتوانێ ڕێگایان لێبگرێت.

بۆنمـوونە یابـان، کە لە ئاسـتێکی هەرەپێشـەوەی زانسـتی تەکنەلۆژیـــا دایەو زۆرتـــرین بـــوومەلەرزە لەو وڵاتە ڕوودەدەن، کەچـی هەمـوو ئیشـیان بـۆ ئەوەیە چـۆن باڵەخانەکانیـان وەهـا

دروست بکەن لەگەڵ بوومەلەرزە نەڕووخێت، یان چۆن کاتی بوومەلەرزە دەستنیشان بکەن، بەڵام خوودی رووداوەکە لە دەرەوەی دەسەڵاتیانە.

هەرچەندە بەشێک لەو کارەساتە سرووشتیانەش دەستی مرۆڤی تێدایە وەك (دەگوترێت) هەندێکجار تاقیکردنەوەی چەکی ناوکی دەبێتە مایەی بوومەلەرزە، یان کاتێك وشکە ساڵی روودەدات خەڵك هەموو رێگاکانی ئاو دەگرن و خانوو و ماڵی تێدا درووست دەکەن، جا کە وەرزی باران ئاسایی دەبێتەوە ئاوەکە لە دۆڵ و شیو و کەندەکان دێتە خوارەوە، هیچ شوێنێکیشی نییە پێیدا بڕوات یەکسەر دەبێتە لافاوو خەڵکێك دەخنکێت و خەڵکانێك ماڵیان ژێرئاو دەکەوێت، ئەوانە راستە رووداوی سرووشتین بەڵام مرۆڤ هۆکاریتی.

کاتێك ئەم جۆرە کارەساتانە روودەدەن بەشێك لە بانگخوازان بە حەماسەتەوە بە غەزەب و خەشمی خوا تەفسیری دەکەنەوە. ئێستا قسە لەسەر ئەوە ناکەین کە غەزەبی خوایە یان نا، بەڵام نابێ لە بیرمان بچێت ئەو رووداوانە لە هەموو شوێنێك روودەدەن. بۆنموونە پیرۆزترین جێگای مسوڵمانان مەککەی پیرۆزو مزگەوتەکەیەتی، کەچی لە مێژوودا چەندین جار کەوتۆتە ژێر لافاوو قوربانی لێکەوتۆتەوە. شوێنەکانی دیکەش بە هەمان شێوە، لە هەندێك شوێنیش روودەدات هیچ کەسی لێ نییەو

هـیچ تـاوانێکی لـێ نەکـراوە. ئەمەش ئەو پرسـیارە دروسـت دەکات: چۆن خـوای گەورە لەبەر گوناهی بەشێکی کەم، ئەو هەموو خەڵکە لەم شوێنە پیرۆزە دەخاتە ژێر غەزەب و خەشمی خۆی؟!

هەروەها هەندێك شوێنی دیکە هەڵکەوتەی جوگرافیایان وایە هەمیشە لافاوی لێ روودەدات، ساڵانە خەڵك خۆی بۆ لافاوەکە ئامادە دەکات، چونکە بەرلەوەی ئاوەدانیشی بچیتێ دۆخەکە ئەگەری لافـاوی وابـووە، بـۆیە کە لە سـاڵێکی دیـاریکراو لافـاوەکە هەڵدەسـتێت، ئینجـا بـانگخوازان بە کـارێکی حکومەتەکەی دەبەستنەوە، دیسانەوە ئەو پرسیارە دروست دەبێت: ئەی بـۆچی بە بەردەوامـی لەم شـوێنە لافـاو هەبـووە، واتە بەر لەوەی ئەو حکومەتەو ئەو نیزامەش بێت، بگـرە پێش ئەوەی ئەو شارەش دروست ببێت؟!.

لە روانگەی ئیسلامەوە ئەم رووداوانە بە کارەساتی سرووشتی نـاودەبرێن. کۆمـەڵێـك سـوودی گەورەشـیان هەیە لە هاوسـەنگی ژیان و ژینگەو پێشـکەوتنی زانستی، وەك پێشـتر باسـکرا، بەڵام خەڵکـی هەمـوو سـەردەمێك لە هەمـوو نهێنییەکـانی تێناگـات. دیـقەت بـدە ئەو نمـوونەی خـوارەوە دەربـارەی شـتێکی سـادەی گیانداران، لەوێوە بەرەو هاوسەنگی نێوان هەسارەکان و تەواوی پێکهاتەکـانی هەسـارەکانی ئـێمەو هەسـارەکانی دیـکەو کۆمەڵەکانی دیکەش بڕۆین.

لە ساڵی (١٩٥٠) نەخۆشی مەلاریا لە مێشوولە درووست بوو، حکومەت بڕیاریدا لە ڕێگەی مادەی کیمیایی (DDT) هەموو مێشوولە بکوژێت. بەمەش مەلاریا کەمبوویەوە. بەڵام گیای سەر بانی خەڵکەکە بەسەریان بەردەبووەوە، چونکە پێشتر کرمۆکەی تەتەڵە میران لەسەر بانی خەڵکەکە دەژیاو ئەو گیایەی دەخوارد، زەرگەتەش کرمەکەی دەخوارد، بەڵام مادە کێمیاییەکە زەرگەتەکەشی کوشت، بۆیە ئێستا هیچ شتێك نییە ئەو کرمۆکەیە رابگرێت، جا کە گیایەکە دەخوات بەسەر خەڵکەکە دەکەوێتە خوارەوە.

ئیدی سەربانەکان هێدی هێدی دەکەوتنە خوارەوە. خەڵکەکە تووشی گرفتێکی گەورەتر بوویەوە، چونکە پشیلە ئەو گیانەوەرانەی دەخوارد کە زەرگەتەی دەخوارد، کە زەرگەتە نەما، گیاندارەکەش نەما، لەمەوە پشیلەکانیش دەمردن و ژمارەیان کەم دەبوویەوە، لەگەڵ ئەوەش ژمارەی جورجەکان (بەهۆی کەمی پشیلەوە) زۆربوون.

جورجیش بەهەمان شێوە خەڵکی تووشی نەخۆشی دەکردەوە، تا وای لێهات ئەو خەڵکەی بەو نەخۆشییە دەمرد ژمارەیان زیاتر بوو لەوانەی بە مەلاریا دەمردن. دواجار هەر لە ساڵی (١٩٥٠) کۆی (١٤,٠٠٠) پشیلەیان هێناو گوندێکی بۆرنیۆ لە ڕێگەی پەرەشووتەوە بڵاویان کردەوە.

دیارە دەبوو دەرمانێکی وابدۆزنەوە چارەسەری مەلاریا بکات و هاوسەنگی ژینگەش تێك نەدات.

پێغەمبەری خوا دروودی خوای لەسەر بێت لە فەرموودەیەکدا باسی ئەو هاوسەنگی ژینگەییە دەکات، دەربارەی ئەو میکرۆبانەی لە رێگەی سەگەوە بۆ مرۆڤ دەگوازرێنەوە، هێندە مەترسیدارن دەفەرمووێت: (فەرمانی کوشتنی هەموو سەگەکانم دەدا، بەڵام ئەوانیش ئوممەتێکی سەربەخۆن بۆیە نابێ لەناوببرێن).

دیقەت بدە، جارێکیان بە گوێرەی ئیجتیهادی خۆی فەرمانی کوشتنی سەگی دا، بەڵام دواتر ئەم فەرمانەی وەستاند و فەرمووی: "ئەگەر سەگەکان بە تەنیا خۆیان ئوممەتێك نەبوونایە، ئەوا فەرمانم دەدا بە کوشتنیان".

هەروەك لە نووری ئەمر هاتووە، واتای ئەمەش ئەوەیە: ئەگەر سەگەکانیش بە وێنەی ئەتەوە جۆراوجۆرەکانی تری ئادەمیزادو رووەکەکان و بێگیانەکان و هتد...، رەگەزێك نەبوونایە لە رەگەزەکانی پاراستنی هاوسەنگی ژینگەیی (التوازن البيئي)، هەروەها بەگوێرەی رێسا گەردوونی و سرووشتییەکان (الشريعة الفطرية) زەروورەتێك نەبوایە لە بوونیداندا، ئەوا ئەو کات فەرمانم دەدا بە لەناوبردنیان.

ئێستا لەو نموونەیەو نموونەی پشیلەکان تێگەیشتین کە چۆن

پێکهاتەکانی ژینگە یەکتری تەواودەکەن. ئەوە یاسا نەگۆڕەکانی خوای گەورەن و سوودی زۆری شاراوە لەخۆدەگرن، بەڵام لەوانەیە هەموو مرۆڤەکان لە هەموو کاتێك تێی نەگەن.

**دووەم: کارەساتە مرۆڤکردەکان.**

ئەو کـردەوانە دەگـرێتەوە کە بەهـۆی کـارێکی مرۆڤەکـان روودەدەن، وەك: (سـووتاندن، خنکـان لە ئیهمـالی، بڵاوکـردنەوەی نەخۆشی لەرێگەی دەرمانەوە، خواردنی مـاڵی گشـتی، ئیسـراف و زێدەڕۆیی، ئازاردانی خەڵك، نادادگەری،...). جا ئەو کـارانە کەسـەکە خـۆی بەسـەر خـۆی دێنێـت، یـان کەسـێکی دیـکە بەسەری دێنێت. ئەوانە کۆمەڵە کارێکن لەبەرئەوەی دەستکردی مرۆڤن، بەرپرسیارێتیان دەکەوێتە سەر شان.

هەنـدێك کـاری سرووشـتی هەیە بە هەمـان شـێوە دەچـێتە چوارچێـوەی کـاری مـرۆڤ، بۆنمـوونە کاتێـك بەهـۆی وشکەساڵی هیچ شتێك ناهێتە بەرهەم ئەوە کارێکی سرووشتییە، بەڵام کاتێـك کشـتوکاڵەکە بەهـۆی کـردەوەی مـرۆڤەوە بەرهەم نـادات وەك تێکـدانی ژیـنگە یـان سـەرقاڵبوونی خەڵـکەکە بە شـەڕی دوژمنـان و نەتـوانینی ئـاوردانەوە لە کارەکانیـان یـان بەکارهێنـانی دەرمـانی خـراپ بـۆ تێکـدانی جـۆرو کـوالیتی بەروبوومە گۆشتی و کشتوکاڵییەکان.

ئەوانە هەرچەندە لە رووکەشدا کارەساتی سرووشتین، بەڵام دەچـنە خـانەی کـارە مرۆڤکردەکـان و مـرۆڤ لە هەمـووی بەرپرسـیارەو دەبـێ بەخـۆش چـاکی بکـاتەوە ئەگینـا بەردەوام دەبێت.

## چۆن بەڵا دەبێتە تاقیکردنەوە؟

لە روانگەی ئیسلامەوە کۆی ژیان تاکو مردن هەمووی تاقیکردنەوەیە، هیچ شتێك لە تاقیکردنەوە بەدەر نییە، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ [المُلك الآية ٢].

واتە: "ئەوە کە مردن و ژینی داهێناوە، تا ئێوە تاقیکاتەوە کامتان کارو ئاکاری جوانترە".

بە گوێرەی ئەم ئایەتە ژیان هەمووی تاقیکردنەوەیە، هەر لەو رۆژەی لە دایك دەبێت تا دەمرێت دواجار هیچی بەلاش نییە، چونکە هەر لە بنەڕەتەوە مرۆڤ هەر بە هەوەنتە دروست نەکراوە، بەڵکو بۆ ئامانجێکی گەورەتر دروستکراوە.

هەموو هەوڵ و کۆششەکانی ژیانی بۆ گەیشتنە ئەو ئامانجەیە، کەواتە هەموو چرکەساتەکانی ژیانی تاقیکردنەوەیە. جا خۆی بەگوێرەی هەوڵ و کاردانەوەکانی بڕیاردەدات چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەم رووداوانە دەکات، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ١١٥﴾ [المؤمنون الآية ١١٥].

واتە: "ئایا گومانتان وادەبرد کە بە ڕاستی ئێمە ئێوەمان بە

بێ مەبەست و بێ هوودە دروست كردووەو ئێوە بۆ لای ئێمە ناهێنرێنەوە؟!".

بێجگە لەوەی ژیان هەمووی تاقیكردنەوەیە، نەخۆشی و دەردو ئازار تاقیكردنەوەیەكی تایبەتین، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٥٥﴾ [البَقَرَة الآية ١٥٥].

واتە: "بێگومانبن جاروبار تاقیتان دەكەینەوە! بە بەشێك لە ترس و برسیەتی و كەمكردنەوەو لەناوچوونی ماڵ و دارایی دنیا و زیانی گیانیی و تیاچوونی بەروو بوو و دەسكەوتەكانتان؛ واتە: دەبێ چاك بزانن سروشتی رێگەی جیهادو سەركەوتن ئەمەیە كە: مرۆڤ بەیناو بەین تووشی ئەم جۆرە زیانە رواڵەتیانە ببێت، بەڵام دەبێ بەئارام و خۆگربێت، دەسا تۆش ئەی موحەممەد! (صلی اللە علیە وسلم) بەوانە كە خۆڕاگرو بەئارامن مژدە بدە".

كەواتە بە گوێرەی ئەم ئایەتە پیرۆزە هەر شتێك ببێتە مایەی ترس و برسییەتی، یان كەمبوونەوەی ماڵ و گیان و بەرهەمەكان، ئەوە تاقیكردنەوەیەكە هیچ گومانی تێدا نییە.

پێشتر روونمان كردەوە كە وەكو دادگەری خودایی و وەكو پاراستنی شكۆی ئاقڵمەندانەو ئازادی مرۆڤ، خوای گەورە ژیانی بە هۆكارو ئەنجامەكانەوە بەستۆتەوە، هەر كاتێك

هۆکـاری کـارە مرۆڤکردەکـان بە چـاکی بگیـرێنەبەر ئەوا ئەنجـامی باشـی لێـدەکەوێتەوە، هەر کـاتێکیش هۆکارەکـان پشـتگوێخران یـان بە خراپـی بەکـارهێنران ئەوا دەرەنجـامی هاوشێوەی خۆیـان دەبێـت، بەڵا سرووشـتییەکانیش دەرەنجـامی یاساو رێساکانن، کە هەموو کەسێك و لە هەموو کاتێك نـازانین چ سوودێکی گەورەی تێدایە.

هەربۆیە هیچ شتێك لە خوودی خۆیدا خراپ نییە، ئەوەی ئێمە بە خراپی تێدەگەین سوودێکی گەورەی هەیە، یـاخود لە بنەڕەتدا شتێکی باشە بەڵام مرۆڤەکان خراپ بەکاری دێنن، بۆنمـوونە ئـاگر هەمـووی سـوودە، ئەگەر ئـاگر نەبێـت ژیـان دەوەستێت، هەر لە خواردنەوە بگرە تا دەچێتە سەر کەرەستەی خـانووکردن و ئۆتۆمبێـل و ئـامێرە ئەلکرۆنییەکـان و فـڕۆکەو کەشتی و تەواوی پێشکەوتنەکانی ژیان بەشی ئاگری تێدایە.

بۆیە کاتێك کەسانێك ئاگر وەکو بۆمبی کوشتن یان بۆ خۆسوتاندن یان زیان گەیاندنە خەڵک بەکاری دێنن، ئەوە باشی ئـاگر رەتناکـاتەوە، ئەسڵەن لەگەڵ چاکەو باشە زۆرەکـانی هەر بەراورد ناکرێن.

کەواتە: هەر شـتێك بەسـەر مـرۆڤ بێـت ئەوە دەرەنجـامی مامەڵەی خۆیەتی، بۆیە کە شتێك روودەدات یەکسەر پێویستە مـرۆڤ چـاو بە هۆکارەکـان دابخشێنێتەوە، کاتێـك بـوومەلەرزە

رووداوەدات چاو بە شوێن و شێوازی خانووەکان و کارگەکان دابخشێنن. کاتێك نەخۆش دەکەوین چاو بە تێکدانی ژینگەو سیستەمی خۆپاریزی دابخشێنینەوە بەتایبەتی بۆ وڵاتە پیشەسازییە گەورەو کارگەکانیان. کاتێك تووشی هەلامەت دەبیت تەماشای خۆپاریزیت بکە.

کاتێك خەڵك تووشی تەنگەنەفەسی دەبێت ئاوڕ لە کارگەکان بدەنەوە چ دووکەڵ و پیسییەك بەرهەم دێنن.

کاتێك هەژاری زۆر دەبێت بڕواننە تەمبەڵی و کارنەکردنی کەسەکان، یان تەماشای سیستەمی دادگەری کۆمەڵایەتی دەوڵەت بکەن.

کاتێك شوانێك سەگێکی هەیەو تێرنانی ناکات، کەسێکی دیکە بە ئاسانی سەرنجی سەگەکە بۆخۆی رادەکێشێت بەمەش دەتوانێ مەڕو ماڵاتی خاوەنەکە لەپێش چاوی سەگەکە بدزێت.

کاتێك منداڵەکەت هیچ رازی دڵی خۆی دەرنابڕێت و کەسانێکی دیکە دەیقۆزنەو تووشی خواردنی مادە هۆشبەرو کێشانی جگەرە دەبێتەوە، دەبێ بە شێوازی مامەڵەی خۆتدا بچیتەوە. کاتێك لە شەڕێک دەدۆڕێنی پێویستە یەکەمجار بەخۆت دابچێتەوە بۆچی هەموو سەربازەکان بەرفەرمانی تۆ نەبوون، لە رووی سەربازییەوە لە چ ئاستێکی پێشکەوتن بوون.

کاتێك ناتوانی دەوڵەتت هەبێت دەبێ بەخۆت دابچیتەوە

لەوەی چەندە کارتان بۆ کۆی خەڵك کردووە، چەندە بەڕاستی برایەتیتان پاراستووە، چەندە گرنگیتان بە پەیوەندی ستراتیژی داوە. بۆیە هەر ڕووداوێکی ناخۆش هەڵوەستەیەك لەلای خاوەنەکەی دروست دەکات بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ هۆکارەکان.

هەر کاتێك بەخۆداچوونەوە لە خۆمانەوە دەستی پێکرد و هەوڵی چاکردنەوەی هۆکارەکانمان دا، ئەوا وڵات پێشدەکەوێت و ئاریشەکان بە سانایی چارەسەر دەبن. ئا لێرەوەیە کە ئیمامی غەزالی پێیوایە، ئەگەر هێسترەکەی چەمووش بێت ئەو تەماشای گوناهی خۆی دەکات، گوناهـ لەوەی چۆن مافی ئەو ئاژەڵەی داوە، چۆن لەسەر ئیشکردنی ڕاهێناوە، چۆن خواردنی پێداوە.

کەواتە: تاقیکردنەوە واتە لەگەڵ تووشبوونی ناخۆشی و دەردو زەرەری ماڵی و گیانی، پێداچوونەوە بە هۆکارەکان و چاککردنەوەی هەڵەو کەموکورتییەکان و دۆزینەوەی باشتری ڕێگەچارە. ئەمەش بە پشتبەستن بە خواو داوای سەرکەوتن.

هەروەها تاقیکردنەوە بەمانای ئەوەش دێت لەرێگەی (ماڵ و سامان و گیان)ەوە ڕێ لە دەردو بەڵابگرێت و سەرکەوتن مسۆگەر بکەی.

جیاوازی ئەم خاڵە لەگەڵ خاڵی پێشتر لەوەدایە، لە خاڵی یەکەم ئەم شتانە دەبوونە قوربانی و خاوەنەکەی بەدوای

چارەسەر دەگەڕا لەرێگەی هۆکارەکان و پشتبەستن بە خوا.

بەڵام لەم حاڵەدا مرۆڤەکان خۆیان قوربانی بە (گیان و ماڵ و سامان) دەدەن بۆ بەرەنگاربوونەوەی نەهامەتییەکان.

ئیمامی رازی لەسەر ئایەتی سەرەوە دەفەرمووێت: مەبەست ئەوەیە بەر لە رووداوەکـــان بە تـــرس و مـــاڵ و منـــداڵ و بەرهەمەکان تاقیدەکرێیەوە، تا لەرێگەی فیداکاری و بەخشینی ئەم شتانەوە رێ لە رووداوەکان بگریت.

ئەمە دەروازەیەکی گرنگی پێشکەوتنە، واتە بۆ پێشکەوتن و رزگاربوون و سەرکەوتن تاقیتان دەکاتەوە بە ترس و برسیەتی و کەمکردنەوەو لەناوچوونی ماڵ و دارایی دنیا و زیانی گیانیی و تیاچوونی بەروو بووم و دەسکەوتەکانتان.

گەلێـــك داوای ســـەرکەوتن بکـــات دەبـــێ ئامادەســـازی هۆکارەکان بە تەواوی بگریتەبەرو ئامادەبێت قوربانی بە گیان و مـاڵ و سـامان بـدات. کاتێـك هێرشـی دوژمـن یـان ئـابڵوقەی ئابووری یان نەخۆشی رووی تێدەکات، نـابێ لە بەرامـبەر هـیچ یەکێکیان چۆک بدات.

بەپێچەوانەوە خوای گەورە موژدە دەداتە خۆڕاگرەکـان کە بـۆ سەرکەوتن، ئامادەن گیان و ماڵ و سامانیان ببەخشن.

کەواتە تـاقیکردنەوەکە هەر ئەوە نییە کەسێکت بمرێت یـان نەخۆش بکەوێت ئینجا ئارام بگری، بەڵکو تـاقیکردنەوە لەوەدایە

كەسەكان لە بەرپرسی یەكەمەوە بگرە تا دەگاتە خواری هەموویان ئامادەبن لە ئاستی خۆیان قوربانی بە گیان و پاڵدانەوەو ماڵیان بدەن، ئامادەبن ماڵ ببەخشن بۆ پێگەیاندنی گەنجێك، بۆ دروستكردنی تاقیگەیەك، بۆ شیاندنی كەسانی زاناو خاوەنكارو گەنج و ئافرەت و منداڵ و پیاو لە هەموو بوارەكانی سیاسی و كۆمەڵایەتی و زانستی و فیكری...

جا ئەوانەی لە تاقیكردنەوەكە دەردەچن ئەوە مژدەی سەركەوتنیان هەیە. بەپێچەوانەوە ئەوانەی خەریكی (هی خۆم بۆ خۆم هی تۆش دەخۆم)، ئامادە نین هیچ قوربانی بە سامانی تایبەتی خۆیان بدەن، بیر لە ئایندەی كورو كچەكانی چوار پشتی خۆیان دەكەنەوە، بەڵام ئامادە نین كەمترین پێگەیاندن بكەن، یان هەوڵی وەدەستهێنانی پۆست دەبێتە حەزی دەوڵەمەندبوون و پارەو پول و ڤێلاو كۆشك و تەلار، ئەوانە قەت سەرناكەون، وەكو كەفی سەر دەریا بە پشە بایەك دەفڕن.

بەداخەوە ئەوە ئەو تاقیكردنەوەیە كە كورد بۆ زیاتر لە سەد ساڵە لێی دەرناچێت، ئاخر بە گوێرەی ئایەتەكە پێویستە بۆ پێشكەوتنی گشتی، ئامادەبین قوربانی بە هەموو شتێكمان بدەین، بەڵام ئەوە چەندین ساڵە لەبەر گیانی حزبایەتی و ئایدۆلۆژیای فیكری و شەڕی دەسەڵات و كۆشك و تەلارو ناوچەگەری، نەگەیشتووین بەو خەونەی هەزاران قوربانیمان بۆ دا.

کەواتە تاقیکردنەوە مانای نووزە نووزو گرین نییە، دابنیشن و خەفەت بخۆن، بەناوی سەبرو ئارامی دەست بەخۆدابەردنەوە. بەڵکو تاقیکردنەوە واتە چۆنییەتی هەڵستانەوە لەرێگەی چارەسەری هۆکارەکان و قوربانیدان بە گیان و ماڵ و سامان و دوورکەوتنەوە لە ئەنانیەت و خۆپەرستی لەپێناوی گەیشتنە سەرکەوتن، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِی خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَیَوٰةَ لِیَبۡلُوَكُمۡ أَیُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗا﴾ [الملك الآية ٢].

واتە: "هەر ئەو خۆی مردن و ژیانی بەدیهێناوە، تا تاقیتان بکاتەوە، کێتان کردەوەی چاکترو پەسەندترە".

لە روانگەی ئیسلامەوە کردەوەی باش تەنیا لە نوێژو رۆژی و زیکر قەتیس نابێت، بەڵکو مانای خواپەرستی هێندە فراوانە هەموو کایەکانی ژیان دەگرێتەوە.

بۆیە گەڕان بەدوای رێگەچارەو هەستانەوە لە کاتی کەتن و ئامادەکاری پێشوەختە هەموویان دەچنە ئەو چوارچێوەیەو پێویستە مسوڵمانان پێشەنگ بن ئەوجا لە تاقیکردنەوە دەردەچن.

## ئایا کۆرۆنا تۆڵەی خوایە؟!

دوای باسکردنی جۆرەکانی کارەسات و حیکمەتەکانی، هەروەها چۆن دەبنە تاقیکردنەوەو، تاقیکردنەوە بە چەند مانا دێت، ئێستا کاتی پرسیارە سەرەکییەکەیە: ئایا کۆرۆنا تۆڵەی خوا بوو لە چین بەرامبەر بەرگریکردن لە (مسوڵمانانی ئیگۆر/ باوەڕدارانی کریستیان/ باوەڕدارانی جوو/ باوەڕدارانی هیندۆس)؟.

وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە پێویستی بە شیتەڵکردنی کۆمەڵە پرسێکی دیکە هەیە:

### خۆتان هۆکاری نەهامەتییەکانن:

بە گوێرەی قورئانی پیرۆز، مرۆڤ خۆی هۆکاری موسیبەتەکانییەتی، وەك دەفەرموێت: ﴿أَوَ لَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡ﴾ [آل عمران الآية ١٦٥].

واتە: "ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: ئەو بەڵایە هەر لەخۆتانەوە بوو تووشتان بوو، هۆی سەرەکی لەخۆتانەوە".

﴿فَكَيۡفَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ﴾ [النساء الآية ٦٢].

واتە: "ئاخۆ ئەوانە حاڵیان چۆن بێت كاتێك بەهۆی ڕەفتاری نادروستی خۆیانەوە بەڵایەك دووچاریان دەبێت".

﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ﴾ [الشورى الآية ٣٠]. واتە: "هەر بەڵاو نەهامەتیەكتان بەسەر هاتبێت، ئەوە دەرئەنجامی ئەو كارو كردەوانەیە كە بە ئارەزووی خۆتان دەتانكرد".

﴿ظَهَرَ ٱلۡفَسَادُ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ بِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِي ٱلنَّاسِ﴾ [الروم الآية ٤١]. واتە: "فەسادو خراپە دەركەوتووەو هەموو سەر زەوی و دەریاكانیشی گرتۆتەوە، بەهۆی ئەو تاوان و گوناهانەوە كە خەڵكی دەستیان داوەتێ".

كەواتە: ئەو بەڵایانە دەرەنجامی كردەوەكانی مرۆڤەكان خۆیانن، ئەوان هۆكارەكانیان بەكارهێناون و ئەنجامەكانیش هاتوونەتە دی بەگوێرەی ئەو یاسا نەگۆڕانەی خوای گەورە دایناون.

## بەڵا بۆچی؟

لە روانــگەی قورئــانەوە ئەو بەڵایــانەی سرووشــتی نــین، دەرەنجامی کرداری مرۆڤەکان خۆیانن، بەڵام ئەو بەڵایانە چین کە دێنە سەریان؟

دەکرێ بەڵای (مردن، برسیەتی، شەڕ، خەمباربوون، کەمی خــواردن و خــواردنەوە...) بێــت، ئەوانە دەرەنجــامی کەســەکان خۆیانن، دەرەنجامی پشتگوێخستنی هۆکارەکانن.

بۆنمــوونە: خــوای گەورە دەربــارەی مســوڵمانان دەفەرمووێــت: ﴿أَوَ لَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ [آل عِمْرَان الآية ١٦٥].

واتە: "ئایا کاتێـک بـەڵاو ناخۆشـیەکتان تووشـهات (لـە جەنگی ئوحود)دا بۆ دەڵێن: ئەمـە چی بـوو؟ بۆ وامـان بەسـەر هات؟ لەکوێوە ئەمەمان بۆهات؟ (ئەی بۆ لەیادیان چوو، خۆ لە جەنگی بەدردا) بەڕاستی ئێوە دووئەوەندەتان بـەوان کـرد؟! ئینجا پێیان بڵێ: ئەو بەڵایە لەلایەن خۆتانەوە توشتان هات".

ئەو ئـایەتە باسـی شـەڕی ئوحـود دەکـات، لەوێ مسـوڵمانان تووشی بەڵایەکی گەورە هاتن و هەفتا کەسیان لێ شەهید بوو، جا خـوای گەورە بە بیریـان دێنێتەوە کە لە شـەڕی بەدردا ئەوان هەمــان دەرد و بەڵایــان بەســەر کافرەکــان هێنــا بــوو، چــونکە حەفتایان لێ کوشتن و هەفتاشیان لێ بە (دیل) گرتن.

بەڵام بەڵایەکەی ئوحود بەهۆی لادان لە هۆکارەکانەوە بوو، لە شەڕی (بەدر) بە جوانی پلانەکەیان جێبەجێکرد، لە شوێنێکی ستراتیژی راوەستان، چوونە سەرووی ئاوەکە، بەشێوازێکی تۆکە ریزیان بەستبوو، لە هەمووشی گرنگتر ئەوان بە تەواوی گوێڕایەڵی پێغەمبەر بوون، بە تەواویش پشتیان بەخوا بەستی بوو.

کەچی لە (ئوحود) وانەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) هەموو لایەن و ئەگەرەکانی شەڕەکەی باش خوێندبووەوە، داوای کرد لە شاری مەدینە بمێننەوەو بەرگری بکەن، بەڵام ئەوان بە گوێیان نەکرد، بەمەش تووشی کۆمەڵە هەڵەی ستراتیژی بوون لەوانە: (هاتنەدەرەوە لە مەدینە، بەجێهێشتنی سەر تەپۆڵکەو کەمکردنەوەی ژمارەی بەرگریکاران، رووکردنە پووڕوو خڕکردنەوەی ماڵی دوژمنان، شکاندنی فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەمانە هەموویان هەڵەی گەورەبوون لە رووی سەربازییەوە، دەرەنجام تووشی ئەم موسیبەتە بوون. مسوڵمانبوون بەبێ ئامادەسازی مەیدانی هیچ دادی نەدان، تا پێغەمبەر (ﷺ) خۆشی بریندار بوو.

لە خوودی ئایەتە خوای گەورە دوو نموونەی سەرکەوتن و بەڵامان بۆ دێنێتەوە، لەگەڵ هەمان کەسەکان بووە، لە یەکەمیان وێڕای پشتبەستن بەخواو گوێڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) هۆکارەکەیان جوان گرتەبەر، بۆیە سەرکەوتن.

ئەوەی دووەم بەپێچەوانەوە هۆکارەکانیان پشتگوێختس و فەرمانی پێغەمبەریان شکاند، بۆیە بەڵایەکیان هاتە سەر کە پێشکەشکردنی ئەو هەموو قوربانییە بوو.

هەروەها دەربارەی مونافیقان دەفەرمووێت: ﴿فَكَيْفَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةُۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ [النِسَاء الآية ٦٢]. واتە: "ئاخۆ ئەوانە حاڵیان چۆن بێت کاتێک بەهۆی ڕەفتاری نادروستیانەوە بەڵایەک دووچاریان دەبێت".

ئەو ئایەتەش باس لە بەڵایەک دەکات کە بەسەر مونافیقان هاتووە، هۆکارەکەشی کردەوەکانی خۆیان بوو. ئەوان لە رووی دەرەکی خۆیان بە مسوڵمان پیشان دەدا، جا پێیان گوترا (کە ئێوە مسوڵمانن) دەبێ بۆ چارەسەری کێشەکانتان بگەڕێنەوە لای پێغەمبەرو بە گوێرەی شەریعەتی ئیسلام چارەسەرتان بداتێ، کەچی ئەوان زۆر بە توندی بەرەنگاری ئەو بڕیارەبوونەوەو روویان لێ وەرگێڕا. پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاریدا بێبەشیان بکات لە بەشداری جیهادو دانیشتنەکانی، ئەمەش سزایەکی گەورە بوو بۆ کەسێك خۆی بە ئەسحابەو هاوەڵ بژمێرێت. جا کە دووڕووەکان زانیان هیچ ئاویان لە دوو بێرێ نەهاتووە، هاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ)و پاکانەی خۆیان دەکردو دەیانگوت: ئێمە لە قسەکانمان چاکەمان دەویست. بەڵام قورئان وەڵامی دانەوە کە ئەو بەڵایە دەرەنجامی کردەوەکانی خۆتانە.

کەواتە لەبەرئەوەی دووڕووەکان هۆکارێکی خراپیان گرتەبەر

كاتێك چوونە لای دوژمنان و رێگرتن بوو لە پەیامی پێغەمبەر (ﷺ)، تووشی ئەو بەڵایە هاتن كە بێبەشبوون لە مەجلیسی پێغەمبەرو بەشداری جیهادكردن، ئەگەر خۆیان كڕكردبا و دژایەتیان نەكردبا تووشی هیچ گرفتێك نەدەبوونەوە.

كەواتە بەڵا دەرەنجامی كردەوەكانی مرۆڤ خۆیەتی. ماوەتەوە ئایا ئەو بەڵایانە دەبنە سزای خوایی؟.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾﴾ [الرُّوم الآية ٤١].

واتە: "تاوان و خراپە دەركەوتووەو هەموو سەر زەوی و دەریاكانیشی گرتۆتەوە، بەهۆی ئەو تاوان و گوناهانەوە كە خەڵكی دەستیان داوەتێ، سەرئەنجام دەبێت تاڵاوی هەندێك لە كردەوەكانیان بچێژن بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ رێبازی پاكی و خواناسی".

**یەكەم:** لەو ئایەتەدا خوای گەورە دەفەرموێت: (الفساد) دەركەوتووە، راغیبی ئەسفەهانی لە ماناكردنەوەی (فەساد) دەڵێت: "واتە شتەكان كەم یان زۆر لەرێگەی دروستی خۆیان دەرچوونە". كەواتە فەساد بۆ هەموو لادانێك بەكار دێت، چ پەیوەندی بە خواردن و خواردنەوە یان بە لاشەوماڵەوە هەبێت. هەموو ئەو شتانە دەرەنجامی كردەوەكانی مرۆڤەكانە. با

نموونەیەکی ئاسان بەکاربێنین، کاتێك (زانست، پەروەردە، ئابووری پشتگوێ دەخرێت)، کاتێك (پالاوگەیەک بە شێوازێکی خراپ نەوتەکە دەپالێوێت و دەوروبەری پڕی دووکەڵ دەکات)، کاتێك (مرۆڤەکان لە سەیران شوێنی گەشتیاری پڕی پاشماوەی گەشتیاریان دەکەن)، یان (دەریاو رووبارەکان پڕی کەلوپەلی خراپ دەکەن)، (کیمیای خراپ لە گژوگیا دەدەن و هەنگ دەکوژن)، کاتێك (زێدەڕۆیی لە ئاودا دەکەن)، کاتێك (ماددەی ناشیاو تێکەڵی خواردن و خواردنەوە دەکەن)، یان (شتە نادروستەکان دەخۆن)، کاتێك (عەدالەت لە بەڕێوەبردنی پارەو دارایی ناکرێت)، کاتێك (پەنا بۆ داوێنپیسی و خواردنەوەی مادە هۆشبەرەکان دەبرێت)، کاتێك (جۆرە خراپەکانی زەواج باو دەبن)، کاتێك (چەکی کۆمەڵکوژ دروست دەکرێت)، کاتێك (پارە بۆ کوشتن و چەتەیی بەکاردێت)، کاتێك (ئایین دەکرێتە ئامرازی پارە کۆکردنەوەو خۆ قەڵەوکردن)، کاتێك (دامەزراندن لەسەر بنەمای شایستەیی نابێت)، کاتێك (پەیوەندی نێوان ژنان و پیاوان دەچێتە قالبێکی نادروست)، کاتێك (منداڵ دایبابی فڕێدەدات)، یان (منداڵەکان وەکو پێویست پەروەردە ناکرێن)، یان...

کە مرۆڤەکان ئەو کارانە دەکەن. ئیدی ژیان تێك دەچێت، دەبێتە مایەی بڵاوبوونەوەی جەهل و نەفامی، نەخۆشی و دەردی ترسناك، هەژاری و کەمدەرامەتی، کوشتن و دزین و

راوەرووت، نەهەنــگ و ماســی لە نــاو دەریــا بەلێشــاو دەمــرن، نەخۆشی جۆراوجۆر بڵادەبنەوە.

بە کورتی، فەسادو خراپەکاری هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوەو هۆکارەکانیش مرۆڤەکان خۆیانن.

دووەم: هەمــوو ئەو شــتانە خەتــای مرۆڤەکــان خۆیــانە، واتە خــوای گەورە بە غەدر دروســتی ناکــات، بەڵکــو ئەوە مرۆڤەکــان خۆیانن بە دەستی خۆیان ئەم وێرانییە دەهێننەوە.

ڤایرۆسەکان دەرەنجامی کاری مرۆڤەکان خۆیانن، بۆنموونە تــا ئێســتاش قسە لەسەر ئەوەیە کە ئەم ڤایرۆسەی کۆرۆنــا لە گۆشتی جۆرە گیاندارە کێوییەکانی وەك شەمشەمەکوێرەو مــار و مێرووخۆرە... دەگەڕێتەوە.

کەواتە: ئەوانە بە دەستی خۆیان ئەو خواردنانەیان خوارد کە نەدەبــوو بیخــۆن، یــان دەگوترێت ئەوە تــاقیکردنەوەیەو لە دەســت دەرچــووە، یــان وڵاتە زلهێزەکــان دژی یەك دروســتیان کــردووە، کەواتە ئەوان بە دەستی خۆیان دروستیان کرد.

لە هەر جۆرێــك بێــت دواجــار ئەوە دەســتی مرۆڤەکــانە (بە دروســتکردن بێــت یــان بە مــامەڵەی نادروســت بێــت) دەبێــتە هۆکاری گەیشتنە مرۆڤ و بڵاوبوونەوەی.

خــوای گەورەش ســوونەنی کەونــی واخوڵقانــدووە کاتێــك مرۆڤەکان هۆکارێك بگرنەبەر دەرەنجامەکەی دێتەجێ.

ئەوە تەنیا بۆ دروستبوونەکە نییە، بەڵکو بۆ گواستنەوەشە، بۆنموونە کاتێك بۆ یەکەمجار دروست بوو، ئەوە مرۆڤەکان بوون چ وەکو تاقیکردنەوە بێت یان وەکو خواردنی گۆشت، ئینجا لەوێوەشـــەوە هەر لەرێـــگەی مرۆڤەکـــانەوە دەگـــوازرێتەوە و مرۆڤەکان بوونە هۆکار، ئەگەر ئەوان بەریەککەوتنیان نەبوایە قەت نەدەگەیشـــتە ئەو دۆخە گەورەیە، کە تـــا ئەمـــڕۆ (٢٠٢٠/٤/٨) لە سەرتاســـەری جیهـــان (١,٤٣١,٩٧٣) کەس تووشی ئەم ڤایرۆسە بوونەو (٨٢,٠٩٦) مردوونە[(١)].

لە مێژوودا کاتێك ئەو نەخۆشییە کوشندانە دروستبوونە بە هەمـــان شـــێوە گواســـتنەوەی لەرێـــگەی مـــرۆڤەوە هۆکـــاری هەرەسەرەکی بووە. بۆنموونە ساڵی (١٣٤٨) کۆمەڵە بازرگانێك لە دەربەندی کریمیا لەسەر دەریای رەشەوە، کە پەتای لێ بووە دەست بە گەشتی دەریایی دەکەن بەرەو دەربەندێکی ئیتاڵیا، بەم جـۆرە نەخۆشـــییەکە بـۆ ئیتاڵیـــا دەگـــوازرێتەوە لەوێشـــەوە بـــۆ ئینگلتەراو چەنـدان شـوێنی دیـکە، کە بە چەنـدین شـێوە ئەم تـــاعوونە دووبـــارە بـــوویەوە تـــا مـــاوەی (٤٠٠) ســـاڵی خایانـــدو خەڵکێکی زۆری کردە قوربانی.

هەروەهـا سـاڵی (١٨١٧) کـۆلێرا وەکـو پەتـا لە هیندسـتان

---

(١) ئەو ژمـارەیە زیـادی کـردووە، ئێسـتا لە (٢٠٢٠/٥/١٤) ژمـارەکە گەیشـتۆتە (٤،٤٤٦،٠٣١)تووشبوو، ژمارەی مردن (٢٩٨،٤٤٢) لە جیهاندا. نوسینگەی تەفسیر

بڵاوبوویەوەو (٢٥) ملیۆن کەسی کوشت، ساڵی (١٨٣١) گەیشتە ئینگلتەرا (١٣٠) هەزار کەسی کوشت. کاتێك کۆلۆمبۆس گەیشتە ئەمەریکا لە ماوەی دوو دەیەدا هەزاران کەسی هەڵگری ڤایرۆسی جەدری لە گەلانی نیمچە دوورگەی ئیبریا روویان کردە ئەو کیشوەرە، ئەمەش بووە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە لە ئەمەریکای ناوەڕاست لە ساڵی (١٥١٨)، مەکسیک لە ساڵی (١٥٢١)، گەلانی ئانکا لە باکوورەوە لە ساڵی (١٥٢٧)، جا لەبەرئەوەی خەڵکە خۆجێیەکە بەرگری لەشیان لاواز بوو بەرامبەر ئەو نەخۆشییەی خەڵکە تازەکە هێنابوویان، بووە مایەی قڕانێکی گەورەی خۆجێیەکان، هەندێکیان لە بن هاتن و بەشێکی دیکەش بۆ شوێنەکانی دیکە کۆچیان کرد. مێژونووسان پێیان وایە (٩٠٪)ی گەلانی هەردوو ئەمریکا لەناوچوون، تا وای لێهات ساڵی (١٦٣٠) لە کۆی دانیشتوانی هەردوو ئەمەریکا تەنیا (٧٪) ئەو خەڵکە رەسەنە بوون کە پێش ساڵی (١٥٢٤) لەوێ نیشتەجێبوون.

**سێیەم:** کاتێك مرۆڤەکان هۆکارە خراپەکان دەگرنەبەر، خوای گەورە دەرەنجامەکانیان دەداتێ، ئەمەش بۆئەوەی هەندێك ئازارو مەینەتی کارە قێزەونەکانیان بچێژن و بگەڕێنەوە. بۆنموونە کە کەسانێکی ناشیاو دەکەنە بەرپرسیاری خۆیان، خوای گەورە لێ دەگەڕێت هەندێك ئازار بەدەست حوکمڕانی خراپەوە ببینن،

بۆئەوەی راستیان بکەنەوە، یان هیچ نەبێت لە جاری داهاتوودا کەسانی باشتر هەڵبژێرن. کاتێك لە خواردنی گۆشتی گیاندارە کێوییە حەرامەکان دەخۆن، تووشی کۆمەڵێك نەخۆشی بە ئازار دەبنەوە بۆئەوەی جاری داهاتوو ئەو گۆشتانە نەخۆن. کاتێك خواردنی زیاد دەخۆن، تووشی ئازاری هەناوەکان دەبن بۆئەوەی جاری داهاتوو هێندە نەخۆن.

کاتێك ڤایرۆسێك دروست دەکرێت دەرەنجام خراپی دەچێژن بۆئەوەی جارێکی دیکە ئەو کارە دووبارە نەکەنەوە. کاتێك شتی ناشیاو لەگەڵ ماست و پەنیرو خواردنە شیرییەکان تێکەڵ دەکەن ئازاری بێتامی و ناخۆشی دەچێژن بۆئەوەی جارێکی دیکە دووبارەی نەکەنەوە. هەموو نموونەکانی دیکە بە هەمان شێوە.

کەواتە ئەو ئازارانە بۆئەوەیە تا بگەڕێنەوە، گەڕانەوە تەنیا بە مانای تۆبەکردن لۆ لای خودا نا، بەڵکو بە مانای لەو کارانە بگەڕێنەوەو ژیان ئاسایی بکەنەوە. لەوێشەوە مرۆڤە وشیارەکان بۆ ئەخلاقی ئیلاهی و خواناسین بگەڕێنەوەو لەو شتانە دووردەکەونەوە کە حەرامی کردووە.

کەواتە ئەگەر تۆبەش نەکەن بە مانای خواناسینی تەواو، بەڵکو خوودی گەڕانەوە لەو شتەی کردوویانە، ئامانجی ئازاری بەلایەکە دەپێکێت کە وازهێنانە لەو کارە تایبەتە.

هەربۆیە کە ئێستا بەهۆی ئەم ڤایرۆسی کۆرۆنا (کۆڤید ۱۹) مرۆڤەکان تووشی ئازاربوونە، کە تا ئێستا ئەم دێرانە دەنووسم نزیکەی سەد هەزار کەس بەهۆیەوە لە سەرتاسەری دونیا مردوونەو ژمارەکەش بەردەوام لە هەڵکشانە، پێویستە خەڵکەکە بگەڕێنەوە، ئەگەر لە هەموو هەڵەکانیشیان نەگەڕێنەوە، بەلانی کەم دەست لە هۆکارە پیسەکان هەڵگرن. بۆنموونە لەگەڵ هاتنی ڤایرۆسی کۆرۆنا ئێستا حکومەتی چین لە شاری شینژین وەك یەکەم هەنگاو بڕیاری دا گۆشتی سەگ و پشیلەو گیاندارە کێوییەکانی دیکە قەدەغە بکات، ئەمەش لەبەرئەوەی ئەگەری زۆر هەیە سەرچاوەی ڤایرۆسەکە بن. کەواتە هەندێکمان تووشی ئەو دەردە دەبین تا خراپی هۆکارەکانمان بۆ دەرکەوێت و بگەڕێینەوە.

لەوێشەوە جوانی پەیامی ئیسلام دەردەکەوێت کە هەر لە بنەڕەتەوە ئەم خواردنانەی قەدەغە کردوون.

بەرامبەر ئەو فیتنەی یەخەی هەموان دەگرێتەوە لەبەرئەوەی ڕێگەی ڕاستی ژیانیان بزرکردووە، خوای گەورە نموونەی گەل و نەتەوە سەرکەوتووەکانمان پیشان دەدا، دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُواْ فَأَخَذْنَٰهُم بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ [الأعراف الآية ٩٦].

واتە: "خۆ ئەگەر خەڵکی شارەکان بەڕاستی باوەڕیان

بهێنایەو خۆیان بپاراستایە، ئەوا بێگومان ئێمە دەرگای فەڕو بەرەکەتی ئاسمان و زەوییان لەسەر دەکردنەوە، بەڵام ئەوان کە پەیام و پێغەمبەرانی ئێمەیان بەدرۆزانی، جا ئێمەش بەهۆی ئەو کاروکردەوانەی کە دەیانکرد گرتمانن و لەناومان بردن".

ئەم ئایەتە هەردوو دیوەکەی تێدایە، ئەگەر باوەڕدار بن لەگەڵ باوەڕەکەشیان خۆپارێز بن، خۆپارێزی بە ئەنجامدانی رێکارو هۆکارەکانی سەرفرازی، ئەوا بەرەکەتی ئاسمان و زەمینیان بەسەردا دەڕژا، بەڵام بەپێچەوانەوە کاری خراپیان کرد، بۆیە هەر بە کارەکەی خۆیان کەوتنە بەر خەشمی خوا، هەر لە رێگەی ئەو کارانەی کردیان دەرەنجامیان دوورییەوە.

## کاتێك بەڵایەکە دەبێتە فیتنەیەکی گشتی:

ئەگەر بەم شێوەی بڕگەی پێشەوە مامەڵە نەکەن، واتە، کەسی نادادگەر نەگێڕنەوەو رێگە لەو تاقیکردنەوە نادروستانە نەگرن و سنوورێك بۆ کارە خراپەکان دانەنێن، ئەوا کەس لە دەرەنجامەکەی ئەمین نابێت، دوایی تەڕ و وشك بە ئاگرەکەیان دەسووتێت، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱتَّقُواْ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً﴾ [الأنفال الآية ٢٥].

واتە: "لەو فیتنەو بەڵایەش خۆپارێزن و بترسن، کە کاتێ دێت، تەنها ئەوقەی ئەوانەتان نابێت ناهەقییان کردووەو دەستیان تێیدایە، بەڵکو یەخەی هەموان - گوناحبارو، بێ گوناح، چاك و خراپ - دەگرێتەوە".

خوای گەورە دەفەرمووێت خۆتان بپارێزن لە فیتنەیەك کە تەنیا تووشی ستەمکارەکە نابێتەوە، بەڵکو بێتاوانەکانیش دەگرێتەوە، دیارە مەبەست ئەوە نییە سزایەك لە دەرەوەوە بۆ ستەمکارەکە دێت، چونکە باسی سزایەك دەکات کە لە خوودی ستەمکارەکەوە دروست دەبێت. ئەمەش واتا نابێ خەڵکی چاکەکار لێ پاڵداتەوەو پێیان وابێت ئەوان خۆیان پاراستووە و لە ماڵێ دەستیان بە کڵاوی خۆیانەوە گرتووە، خەڵکی دیکە چی دەکات پەیوەندی بەوانەوە نییە، بەپێچەوانەوە قورئان فێرمان

دەکات دەبێ بزانین خوای گەورە سوونەتی ژیانی وەها دروستکردووە هەمووی پێکەوە بەستۆتەوە، کاتێك ڕێگەدەدەی کەسێك خراپە بکات ئەوا دواجار دەردێکی لێوە دروست دەبێت بێتاوانەکانیش دەگرێتەوە.

بۆنموونە: هۆکارێکی سەرەکی ئایدز داوێنپیسییە، دەبێ دەوڵەت و خەڵك ڕێگە لە داوێنپیسی بگرن، ئەگینا دوایی فیتنەیەکی وەهای لێ دروست دەبێت تەنیا ئەو ستەمکارە ناگرێتەوە کە تاوانەکەی کردووە، بەڵکو لەوانەیە کەسێک لەرێگای داوێنپیسییەوە تووش ببێت، ئینجا بە حەڵاڵی بچێتەوە لای هاوسەرەکەی ئەویش لێی بگرێتەوە، ئینجا لەرێگەی خوێنەوە بۆ منداڵەکەش بگوازرێتەوە.

یان کاتێك کەسێکی ستەمکار شەڕ بە کەسانێك دەفرۆشێت، چاکەکانیش بێدەنگ دەبن، دواتر ئافاتەکەی هەموان دەگرێتەوە، شەڕەکە هەموان تێیدا تووشی زیان دەبن، کاتێك سەدام حوسێن هێرشی کردە سەر عێراق، زۆربەی شۆڕەتمەندان و خەڵکە قسەرۆییشتووەکە بێدەنگبوون، دواجار زیانەکەی بۆ هەموان بوو، کە عێراق بەهۆیەوە تا ٢٠٠٣ لە گرانی و چەرمەسەری بوو، وێڕای هەتیوکەوتن و بێوەژنبوون و جەرگسووتان و چەندان ناخۆشی دیکە، کە هەموو عێراقییەکان بە دەستیانەوە هاواریان بوو، بە هەمان شێوە کاتێك سامانی وڵات

بە ناعەدالەتی دابەش دەکرێت و دەبێتە مایەی ئازار بۆ خەڵك، کەس لە دەرەنجامەکەی ئەمین نابێت، سیخوڕی زۆر دەبێت، بازاڕ تێك دەچێت، هەژاری بڵاودەبێتەوە، بەمەش پیاوکوژی و بەکرێگرتەیی زۆری دەبێت، دزین و تالآن زۆر دەبێت، لەشفرۆشی زۆر دەبێت، منداڵی بێ پەناگە زۆر دەبن.

بە هەمان شێوە کەسانێك لە پەنای ئایینەوە خۆیان قەڵەو دەکەن و ئایین بۆ فرت و فێڵ بەکاردێنن، مسوڵمانەکانیش بەتایبەتی زانایان لە ئاستیدا بێدەنگ دەبن، دواجار خوودی بانگەوازی و دینداری باجەکەی دەدات.

بە هەمان شێوە دەبێ پێکەوە هەوڵی پێشخستنی زانست بدەن، کاتێك زانست پشتگوێ دەخرێت هەموان زیانمەند دەبن. دەبێ ئاقڵمەندان رێگە لە تاقیکردنەوەی ڤایرۆسە بکوژەکان بگرن، چونکە دواتر کە بڵاوبوویەوە ئازارو عەزابەکەی تەنیا بۆ ئەنجامدەرە ستەمکارەکان نییە، بەڵکو هەموان دەگرێتەوە.

ئەوە مانای ئایەتەکەیە، نەك عەزاب لە دەرەوەی کردەوەکانی مرۆڤەکانەوە بێت و تووشی هەموویان ببێت.

نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێتەوە کە ئەم کارانە هەموویان بە دەستی مرۆڤەکان خۆیانە، بەگوێرەی ئەو سوننەتە گەردوونیە نەگۆڕانەی خوا دایناون،

## نەخۆشیی و تۆڵەی خودایی:

لە بڕگەی رابردوو تێگەیشتین سزاکان لە خوودی کارەکانەوە دەردەچن، بەڵام ئایا ناکرێ ئەو شتانە تۆڵەی خوایی بن؟

بەڵێ دەکرێ تۆڵەی خودایی بن، بەڵام بەو مانایەی لە بڕگەی پێشەوە باسمان کرد، کە ئەوانە بە شێوەیەکی نادروستی بە کارێك هەڵستاون، ئینجا لە خوودی کارەکە تۆڵەیان لێ دەبێتەوەو ئەنجامی خراپی لێدەکەوێتەوە، چارەسەریشی ئەوەیە لە کارەکە بگەڕێنەوە. بەم تێگەیشتنە کە لە ئایەتی بڕگەی رابردوو وەردەگیرێت، دەرگا بە رووی هەموو هەوڵە زانستییەکان دەکرێتەوە، کە لە رێگەی دۆزینەوەی چارەسەرەوە کێشەکە چارە بکەن. هەروەها نەگەڕێنەوە سەر ئەنجامدانی هەمان کارەکە. بەپێچەوانەوە ئەگەر پێمان وابێت ئەوە خوا لە دەرەوەی کارەکانی مرۆڤ بەلایەکەی ناردووە. کەواتە دەستەوەستان رادەوەستین تا خوای گەورە بەشێوەی موعجیزە لەسەرمان لادەبات، بەپێچەوانەی ئاقیدەی مسوڵمانان کە لە یەك کاتدا بەدوای دەرمان و دوعای شیفا بگەڕێین.

## چ کاتێك سزای خوایی دێت؟

ئەوەی وای لە خەڵکێك کردووە هەموو ئەو نەخۆشیانە بە سزای خوایی بزانن، خوێندنەوەی ئەو هەموو نموونانەیە، کە لە قورئاندا باسکراوە، لەو هەموو جۆرە سزایانەی بەسەر ئوممەتانی پێشوو هاتوونە، بەتایبەتی گەلەکانی پێغەمبەران (نوح و موسا و ئیبراهیم و لوت و سالح و هوود و ...).

بۆیە کاتێك گفتوگۆت لەگەڵ دەکەن یەکسەر ئەو نموونانە دەهێننەوە،لەوەشدا راست دەکەن،کە ئەوانە نموونەی راشکاوانەن لەسەر هاتنی سزای خوایی بۆ سەر ئەو گەلانە رژاوە، لە سزایەکەش سەد دەر سەد دڵنیاین، چونکە لەلایەکەوە قورئان باسیکردووە، لەلایەکی دیکەش هەموو مەرجەکانیان تێدا بووە. بەڵام ئایا بۆ سەردەمی ئێستا (دەکرێ) بە هەمان دڵنیاییەوە قسە بکەین؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەچینە خزمەت ئایەتێکی قورئانی پیرۆز، کە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَاءُوهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَانتَقَمْنَا مِنَ الَّذِينَ أَجْرَمُوا ۖ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾﴾ [الرّوم الآية ٤٧].

واتە: "بەڕاستیی پێش لەتۆیش ئەی پێغەمبەر پەیامبەرانی

زۆرمـان رەوانـەکردن بـۆلای هـۆزو گـەلیان، ئـەوجا هـەموویان بـە بەڵگەو نیشانەیەکی زۆری ئاشکراوە هاتنە لایان، بەڵام ئەوان هەرباوەڕیان نەهێنا، جا ئێمەش تۆڵەمان سەند لەوانەی تاوانیان کردو کافربوون، خۆ سەرخستن و یارمەتیدانی بڕوادارانیش مافێکە لەسەر خۆمان واجبمان کردووە".

لەژێر رۆشنایی ئەم ئایەتە تۆڵەی خودایی چەند مەرجێکی هەبووە:

**یەکەم:** سزایەکی دڵنیایی و مسۆگەر

دەربارەی خەڵکەکە، خوای گەورە فەرمووی پێغەمبەرانمان بۆ ناردوون. کەواتە بابەتەکە روون بووەو تەواو لەگەڵ پێغەمبەران بووە، ئەوانیش راستەوخۆ لە رێگەی وەحییەوە هەموو شتێکیان زانیوە دەربارەی خەڵکەکە. بۆیە ناکرێ شتێکی بە گومان دەبارەی خەڵکێك بڕیارێکی وەها یەکلاکەرەوەی لە بارەوە بدەین.

**دووەم:** پەیامێکی روونیان پێگەیشتووە

خوای گەورە فەرمووی: پێغەمبەرانمان بۆ ناردن، پێغەمبەرانیش هەر ئەوە نەبووە بڵێن ئێمە پێغەمبەرین، بەڵکو بەڵگەی زۆر روونیان پێشکەش کردوونە، ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕیان نەهێناوە.

کەواتە: پێویستە ئەو خەڵکە پەیامی خوایان بە چاکی

پێگەیشـــتبێت، بـــۆیە نەتەوەو گەلێـــك پەیـــامی خـــوایی نەگەیشـتبیتێ، یـان بە بەڵـگەوە تێنەگەیشـتبێت ئەوە عـوزرو پاساوی بەدەستە.

لەوەدا ئیمـامی غەزالـی رای وایە، کە ئەگەر کەسـانێك ئیسـلامیان نەگەیشـتبیتێ، یـان بە دروسـتی نەگەیشـتبێت، بە هەنـدی خۆشـیان کەمتەرخەمـی و کێماسـیان نەکردبێـت لە تێگەیشـتنی، یـان وەك، مـوفتیزادە دەڵێـت: ئەگەر ئیسـلامێکی بەرجەســـتەکراوی نمـــوونەیەکی جـــوانی مســـوڵمانانەیان پێنەگەیشتبێت، ئەوانە لەسەر ئیسلام هیچ گوناهبار نابن.

کەواتە خوای گەورە سزایان نادات، تا پەیامی پێغەمبەرانیان بە چاکی پێنەگات وەك دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا غَٰفِلُونَ ﴿١٣١﴾﴾ [الأنعام الآية ١٣١].
واتە: "ئەو ناردنی پێغەمبەرانە بۆ ئەوەیە چونکە پەروەردگاری تۆ (نەیکردووە بەعادەت) کە لەناوبەری شارو شوێنەکان بێت بە ناحەق، لەکاتێکدا خەڵکەکەی غافڵ و بێ ئاگا بن و پەیامی خوایان پێ ڕانەگەیەنرابێت".

کاتێك پەیامەکەشیان پێگەیشتبێت سزاکە ئەوانە دەگرێتەوە کە ستەمکارن ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِىٓ أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا ۚ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِى ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾﴾ [القصص الآية ٥٩].

واتە: "پــەروەردگاری تــۆ هــیچ وڵات و شــارێکی کــاول نـەکردووە، تـا لـە پایتەختەکـەیدا پێغەمبـەرێکی نـەناردبێت کـە ئایەتـەکانی ئێمـەیان بەسـەردا بخوێنێتـەوە، وەنـەبێت ئێمـە شـار و وڵاتانمـان کـاول کردبێـت بـەبێ هـۆ، مەگـەر کاتێـك نـەبێت کـە دانیشتوانی ستەمکار بوون".

خـۆزگە مسـوڵمانان هێنـدەی بیـر لە تـۆڵەو سـزای خـودا دەکەنەوە، بیریـان لەوە بکردبـایەوە چـۆن پەیـامی ئیسـلام بە گوفتارو رەفتاری جوانەوە بگەیەننە هەموو کون و کەلەبەرێکی دونیا. خۆزگە دەسووتاین لەوەی چ کەمتەرخەمیمان کردووە لە گەیاندنی پەیامی خوا بۆ ئەم شوێنانە.

**سێیەم:** تاوانباران سزا دەدرێن

ئینجـا ئەو خەڵـکە باوەڕیـان بە پێغەمـبەران نەهێنـا، خـوای گەورە سـزای دان، بەڵام سـزایەکە گشـتی نەبـوو، بەڵکـو وەك فەرمـووی: ﴿فَٱنتَقَمْنَا مِـنَ ٱلَّذِيـنَ أَجْرَمُـوا۟﴾. واتە: "ئێمەش تۆڵەمان سەند لەوانەی تاوانیان کرد".

کەواتە تـۆڵەکە بـۆ ئەوانە بـووە کە تاوانیـان کـردووە، نەك کەسـێك کە نـازانم ئیسـلامی پێگەیشـتووە یـان نـا، نـازانم بە دروستی و بەڵگەی ئاشکراوە پێیگەیشتووە یان نا، نازانم تاوانیان کردووە دەرهەقی ئەو پەیامە یان نا. تەنیا بۆ هەڵڕشتنی کەفی دڵم بڕیارێکی وەها بدەم.

لە ئـایەتێکی دیـکەدا خـوای گەورە بە ڕوونـی بـاس دەکـات ئەوانەی خراپە لەخۆیان دووردەخەنەوە رزگاریان دەبێت، ئەوانەش، کە ستەم دەکەن دەکەونە بەر سزایەکە، وەك دەفەرموویت: ﴿فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ﴾ [الأعراف الآية ١٦٥].

واتە: "جا کاتێـک فەرامۆشیان کـرد ئـەوەی ئامۆژگاریـان پێـی کرابـوو، ئێمـەش ئەوانـەی، کـە قەدەغـەی خراپەیان دەکـرد ڕزگارمـان کـردن و ئەوانـەش، کـە ستەمیان کـردو هەوڵیانـدا بـۆ کردنی ئەوکارە نارەوایە، بەسزایەکی سـەخت گیرۆدەمـان کـردن، بەهۆی ئەوەی لە سنوور دەرچوو بوون".

کەواتە بە گـوێرەی ئەم ئـایەتە سـزاکە بـۆ ئەوانەیە، کە سـتەمەکە دەکەن، بەڵام ئەوانەی خۆیـان دووردەگـرن رزگاریـان دەبێت.

جـا ئەمە بـۆ سـەردەمی پێغەمـبەران ئاسـایی بـووە وەکـو مـوعجیزەیەکی پشـتیوانی پەیامەکەیـان نەخۆشـی و بەڵای دەرەکیـان بـۆ بێـت، بەڵام دوای پێغەمـبەران ئەو بەڵایـانە لە رێـگەی هۆکارەکـانەوەو بە دەسـتی مـرۆڤەوە دەبـن. وەك خـوای گەورە دەفەرموویت: ﴿مَنِ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ وَمَنْ ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولًا ۝١٥ وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَٰهَا تَدْمِيرًا ۝١٦﴾ [الإسراء: ١٥- ١٦].

واتە: "ئەوەی هەوڵی دابێت ڕێبازی ڕاست و دروست بگرێت، ئەوە بەڕاستی بەقازانجی خۆی تەواو دەبێت و هەر خۆی بەهرە لە هیدایەتەکەی وەردەگرێت، ئەوەش گومرا بووەو ڕێبازی سەرلێشێواوی گرتۆتەبەر، ئەوە بێگومان هەر خۆی زەرەر دەکات و گومراییەکەی لەسەری دەکەوێت، کەس گوناهی کەس هەڵناگرێت، کەس بەرپرسیار نیە لە هەڵەی کەسانی تر، ئێمەش سزای کەسمان نەداوە تا پیغەمبەرێکی بۆ دەنێرین * کاتێك بمانەوێت دانیشتوانی شارو شارۆچکەیەك لەناو ببەین، ئەوە سەرەتا فەرمانی گوێڕایەڵی دەدەین بە دەوڵەمەندەکان، کەچی ئەوان یاخی دەبن و خراپەکاری دەکەن لە شارەکەدا، ئەوسا ئیتر شایستەی ئەوە دەبن کە بڕیاری ئێمە بەسەریاندا بسەپێنرێت، ئینجا ئێمەش کاولی دەکەین بەسەر یەکداو داروبەردی بەسەر یەکەوە ناهێڵین".

ئەو ئایەتە هاوشێوەی ئایەتەکەی پێشەوە سێ پەیامی تێدایە: (کەس گوناهی کەس هەڵناگرێت. سزا نایەت هەتا پەیامەکە بە تەواوی و ڕۆشنی نەگاتە خەڵکەکە بەجۆرێك هیچ بەهانەو حوجحەیەکی حاڵیبوونیان نەمێنێت. ئەوان خراپەکار دەبن و سزایان بۆ دێت).

لێرە مەبەست ئەوە نییە خوای گەورە سزایەکیان لەسەر دەسەپێنێت، ئەوە پێچەوانەی سوننەت و ڕێسا جێگیرەکانی خودان

لە ژیانـدا، بەڵکـو لەرێـگەی پەیـامی پێغەمـبەرانەوە رێـگەی چاک و خراپیان پێدەگات، بەڵام ئەوان لەرێگەی کەللەرەقی و پابەنـدبوون بە داب و نەریـتەوە لەبـری چـاکە دەسـت دەکەنە خراپەکـاری، ئینجـا خـوودی خراپەکەیـان بەجـۆرێکە دەبێـتە هۆکـاری بەڵایەکـی گەورە هەموویـان لەنـاو دەبـات، ئەمەش بەگـوێرەی سـوننەتی خـوایی کە هۆکـارو دەرەنجـامی پـێکەوە گرێداون.

کەواتە خوا نەخۆشییەك یان بەڵایەکیان لەسەر فەرز ناکات، ئەمە مەگەر بـۆ پێغەمـبەران وەکـو مـوعجیزە هاتبێـت. بـۆ پێغەمبەرانـیش بەشـێوەیەکی گشـتی نەبـووە. بەڵکـو مەبەسـت ئەوەیە خراپەکارەکـان کارێـک دەکەن خـودی کـارەکە دەبێـتە نەخۆشـی، وەك خـوای گەورە فەرمـووی لەبـری گـوێڕایەڵی خراپەکاری دەکەن، جا گفتی ئێمەیان لێ دێتە جێ و لەناویـان دەبەیـن، گفتـیش خـواش ئەو یاسـاو رێسـا نەگـۆڕانەن کە دەرەنجامی هۆکارەکـان نە دوادەکەوێت و نەگۆڕانیشـی بەسـەر دادێت.

## پەند لە ڕابردوو وەرگرن:

هەموو ئەو ئایەتانەی باس لە سزای خوایی دەکەن، تایبەتن بە ئوممەتانی پێش ئیسلام، هەمووشی بۆ ئەوەیە ببێتە پەندو عیبرەت. لەوانەوە خاڵی سەرکەوتن و دۆڕان فێربین.

بۆنموونە: لە کەللەڕەقی فیرعەون خاڵەکانی غرووری و دۆران بزانین، لە بەسەرهاتی حەزرەتی یوسف پلانی ستراتیژی و دووربین فێر ببین، لە وشیاری بەڵقیس فێربین چۆن لە کاتی گرفت و ئاریشەی گەورەدا سەرکردەی ژێر خۆیی و وڵاتەکەی لەو شەڕانە دووربخاتەوە، کە دۆڕانی مسۆگەرە.

جا ئێستا چەند نموونەیەك لەو گەلانە دێنینەوە کە تووشی سزای خوایی هاتنەوە، هەروەها ئەوەش چۆن لەگەڵ هەریەکێکیان خوای گەورە بێدارمان دەکاتەوە تا تێڕامێنین و پەندو ئامۆژگاری لێوەربگرین:

خوای گەورە باسی پێغەمبەران و گەلەکانیان دەکات، لە پێغەمبەران نموونە بە (حەزرەتی نوح، حەزرەتی ئیبراهیم، حەزرەتی لوت، حەزرەتی شوعەیب، حەزرەتی موسا) دێنێتەوە، ئینجا باسی (گەلانی عادو سەموود، قارون و فیرعەون و هامان) دەکات، کە چۆن لەلایەن پێغەمبەرانەوە بەڵگەو نیشانەی مژدەو ترساندنیان بۆ هاتووە، بەڵام ئەوان وازیان لە

ستەمکاری خۆیان نەهێناوە، پشتی هەنگی دەفەرمووێت: ﴿فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ [العَنكَبُوت الآية ٤٠].

واتە: "ئێمە هەر یەکێك یان هەر دەستەیەك لە وانەمان بە سزای تاوانی خۆی گەیاند، جا هەیان بوو بەرد بارانمان کرد، هەیان بوو دەنگ و سەدای بە هێز لەناوی برد، هەیان بوو بە ناخی زەویدا بردمانە خوارەوە، هەشیان بوو نوقمی دەریامان کرد، جا وە نەبێت خوا ستەمی لێ کردبن، بەڵك و خۆیان ستەمیان لە خۆیان دە کرد".

کەواتە پاشی هەموو بەڵگەکان، بە دەستی خۆیان خۆیان شیاوی ئەو سزایە کرد. بۆ ئێمەش پەندو ئامۆژگارییە، وەك دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا۟ ٱلْأَرْضَ وَعَمَرُوهَآ أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ [الرُّوم الآية ٩].

واتە: "ئایا بەسەر زەویدا نەگەڕاون، تا تەماشا بکەن و سەرنج بدەن چیمان بەسەر ئەو نەتەوانەی پێش ئەماندا هێناوە، لەمان زۆر بەهێزترو بە دەسەڵاتتر بوون، زەویان ژێرەو ژوور دەکرد (واتە دەیان کێڵا بۆ کشتوکاڵ و کانزایان لێ دەردەهێنا)و

ئاوەدانیان کردبۆوە زیاتر لەمان، پێغەمبەرەکانیشیان کاتی خۆی بەڵگەی زۆرو ئاشکرایان بۆ هێنان؟ (بەڵام بێ سوود بوو، زۆربەیان بڕوایان نەکرد) جا وەنەبێت خوا ستەمی لێکردبن، بەڵکو هەر خۆیان ستەمیان لە خۆیان دەکرد".

﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ﴾ [يوسف الآية ١١١].

واتە: "بەڕاستی لە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتی پێغەمبەران پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسانی ژیرو هۆشمەند".

## کێن سەربازەکانی خوا و چۆن پشتیوانی باوەڕداران دەکەن؟

لە قورئانی پیرۆزدا لە چەندین شوێن وشەی (سەربازەکانی خوا) هاتوونە، جا ئەوانەی نەخۆشییەکان بە تۆڵە دەزانن ئەم ڤایرۆسانە وەکو سەربازی خوا دەناسێنن.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز چەند شتێکی بە سەربازو (جوندییەکانی خوا) ناوبردووە، وەك: (باوەڕداران، فریشتەکان، باو باران).

### یەکەم: باوەڕداران

کاتێك مسوڵمانان پەیماننامەی حودەیبەیان لەگەڵ قورەیشییەکان بەستی، زۆر دڵتەنگبوون و چەلەحانێیەکی زۆریان کرد، چونکە پێیان وابوو شکستێکی زۆری تێدایەو لە رواڵەتدا سەرکەوتنی قورەیش بوو.

جا لە سوورەتی فەتحدا خوای گەورە باسی پشتیوانی خوایی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەکات، ئینجا دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ ٱلْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَٰنًا مَّعَ إِيمَٰنِهِمْ ۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٤﴾﴾ [الفتح الآية ٤]. واتە: "هەر ئەو خوایە خۆی ئارامی و هێمنی دابەزاندۆتە

سەر دڵی ئیمانداران، بۆ ئەوەی کە ئیمانیان دامەزراوترو پتەوتر بکات، سەرەڕای ئیمانداری و خواناسیان ئیمانیان زیاد ببێت، بێگومان هەرچی سەربازانی ئاسمانەکان و زەوی هەیە هەر خوا خۆی خاوەنیانە، هەمیشە و بەردەوام خوای گەورەزانایە بەهەموو شتێک و دانایە لەهەموو کارێکدا".

لەو ئـایەتەدا هەرچـی لە ئاسـمانەکان و زەمینـدا هەیە بە سەربازی خوا هەژمار دەکرێن، خوا هەرکامەیانی بوێت دەتوانێ بـۆ سەرخسـتنی پێغەمـبەر (ﷺ) بەکاریـان بێنێت، بەڵام هـیچ یەکێکیـانی بەکارنەهێنـا، بـۆ خـوا ئاسـان بـوو لەو کـاتەی مسوڵمانان لە رێگادا بەرەو مەککە دەرۆیشتن، زریـان و لافاوێك یـان دەردێك بـۆ قـورەیش بنێرێت هەمـوان بەجارێك لەنـاو ببـات، بەڵام خوای گەورە ویستی مسوڵمانان فێری ئەوە بکات چۆن لە سوونەتی ژیان تێبگەن، کە خوای گەورە هەمیشە ئەنجامەکانی بە هۆکارەکـان بەسـتووەتەوە، بـۆیە دەگەڕێـنەوە ئینجـا دوای ئامادەسـازی تەنیـا بـاوەڕداران وەکـو سـەرباز بەکاردەهێنێـت، بەجۆرێك ئارامی دەخاتە دڵییانەوە، خۆڕاگریان دەکات.

ئیـبن عاشـور سـەرنجێکی جـوانی لەسـەر (عَلِـيمٌ) هەیە، دەفەرموویت: "خوای گەورە هۆکارەکانی فەتح و سەرکەوتن بە باشی دەزانێت، هەروەرها بەباشی دەزانێت دڵی باوەرداران بەچی هێورو ئـارام دەبێـتەوە دوای بەلـبەلەو چەلەحانێیـان". مامۆسـتا

ئەحمەد کاکە مەحموودیش جوانی بۆ چووە کە دەڵێت: "وە بۆ خوایە لەشکرەکانی ئاسمانەکان و زەویی: لە جنۆکە و فریشتەو هەورە تریشقەو گەردەلوول و زەمین لەرزەو لافاوو تۆفان.. هتد، ئەگەر خوا خۆی بیەوێ قورەیش لەناو ببات تەنها یەك فریشتەیان بەسە، بەڵام جیهادی پێویست کرد، چونکە لە جیهاددا بەڵگەی جەرگبڕ بەدی ئەکرێ بۆیان".

کەواتە ئایەتەکە پێمان دەڵێت: سوننەتی خوای گەورە وایە پشتیوانی مسوڵمانان دەکات لە ڕێگەی هۆکارەکانەوە، ئەوان هێزو بازووی خۆیان بەکاربێنن، ئەقڵ و مێشکی خۆیان وەکار بێخن، هەموو توانستەکانیان لە هەموو بوارەکان پەرەپێبدەن، ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ﴾ [الأنفال الآية ٦٠] ،

واتە: "هەرچی هێزی لە تواناتاندا هەیە ئامادەی بکەن". کەواتە سەرکەوتن بەوە دەبێت لە هەموو لایەکەوە خۆیان بەهێز بکەن و پشت بە خوای گەورە ببەستن ئینجا خوای گەورە سەرتان دەخات، بەڵام نەیکردۆتە سوونەت ئێوە پاڵدەنەوە، تەمبەڵ و دواکەوتوو و خەریکی یەکترخۆری بن، خواش شتێکی موعجیزەئاساتان بۆ بنێرێت، بەڵکو دەبێ ئێوە لە ئاستێك بن هەر خۆتان ببنە ئەو موعجیزە خواییە.

ئینجا دوای ئەوە خوای گەورە هۆشداری دەداتە دووڕووەکان و موشریکەکان کە گومانی خراپ بە خوا دەبەن، دەفەرمووێت

كە خوای گەورە سزایان دەدات، ئینجا دەفەرمووێت: ﴿وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ [الفتح الآية ٧]. واتە: "هەرچی سەربازی هەیە لەئاسمانەكان و زەویدا، هەر خوا خۆی خاوەنیانە و لەژێر فەرمانی ئەودان، هەمیشە و بەردەوام ئەو خوایە باڵادەست و دانایە".

كەواتە هەر یەك لەوانە دەتوانێ بەكاریان بێنێت بۆ بەزاندنی دوژمنانی مسوڵمانان، بەڵام خوای گەورە بەو سەربازانە سزایان نادات، بەڵكو دواتر خوای باڵادەست هەمان ئەو دووڕوو و موشریكانە سزاییەكی دەروونیان دەدات كاتێك بە سەركەوتنی مسوڵمانان تووشی خەفەت دەبن، هەروەها لە جەنگی مەیدانیشدا دانایانە لەڕێگەی باوەڕدارانەوە دەیان بەزێنێت. سەبارەت بە خەفەتخواردن دەفەرمووێت: ﴿هَٰٓأَنتُمْ أُوْلَآءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلَا يُحِبُّونَكُمْ وَتُؤْمِنُونَ بِٱلْكِتَٰبِ كُلِّهِۦ وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ عَضُّواْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَنَامِلَ مِنَ ٱلْغَيْظِ ۚ قُلْ مُوتُواْ بِغَيْظِكُمْ﴾ [آل عمران الآية ١١٩]،

واتە: "ئاگاداربن! ئێوە ئەوانتان خۆش دەوێت، بەڵام ئەوان ئێوەیان خۆش ناوێت و باوەڕتان بە هەموو كتێبە ئاسمانیەكانیش هەیە، كاتێكیش پێتان دەگەن دەڵێن: ئێمە ئیمانداریں، بەڵام كاتێك بە تەنها دەبن، پەنجەی خۆیان دەگەزن ئەوەندە ڕق ئەستوور و داخ لە دڵن، پێیان بڵێ: دەك بمرن لە داخا".

هەروەها لە جەنگی مەیدانیشدا دانایانە لەڕێگەی

باوەڕدارانەوە دەیان بەزێنێت، وەك دەفەرمووێت: ﴿قَٰتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ﴾ [التوبة الآية ١٤]. واتە: "بجەنگن دژی بێباوەڕان، ئەوە خوایە کە **به دەستی ئێوە** سزایان دەدات و سەرشۆڕو خەجاڵەتیان دەکات و ئێوە بەسەریاندا سەر دەخات".

## دووەم: فریشتەکان

فریشتەکان وەکو سەربازی خودایی بۆ پشتیوانی پێغەمبەر (ﷺ) و باوەڕداران هاتوونە، بۆنموونە لە سوورەتی تۆبە خوای گەورە دوو حاڵەتی پشتیوانی فریشتەکان وێکرا باس دەکات، دیارە ئایەتەکان لە بابەتی جەنگی تەبووکەوە هاتوون، ئە وە ش لەبەرئەوەی رەوشـــی کەش و هەوا زۆر گەرم بـــووە زۆرێـــك لە باوەڕداران سست و خاوبوونە، خوای گەورە پێیان دەفەرمووێت: ﴿إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ [التوبة الآية ٤٠].

واتە: "ئەگەر ئێوە پشتگیری پێغەمبەر (ﷺ) نەکەن و یارمەتی نەدەن، ئەوە بەڕاستی خوا پشتگیری کردو سەری خست، کاتێک ئەوانەی بێباوەڕ بوون دەریان کرد لە شاری

مەککە و یەکێک بوو لەو دوو کەسە کاتێک هەردووکیان لەناو ئەشکەوتەکەدا بوون (کاتێک بێباوەڕەکان گەیشتبوونە دەوروبەری ئەشکەوتەکە ئەبوبەکری هاوەڵی خەمی لێهات) پێغەمبەریش (ﷺ) دڵی دایەوە و پێی وت: خەفەت مەخۆ، دڵنیابە خوامان لەگەڵە، ئەوسا ئیتر خوا ئاسوودەی و ئارامی خۆی دابەزاندە سەری و پشتگیری و بەهێزی کرد بە سەربازانێک کە ئێوە نەتاندەبینین و بەرنامەو ئاینی بێباوەڕانی دانەواند و ڕیسواتری کرد، بەرنامەو ئاینی خوایش هەمیشە بەرزو بڵندترە، خوایش هەمیشە باڵادەست و دانایە".

**ئەم ئایەتە لە چەند خاڵێك چڕ دەکەینەوە:**

١- هەرچی لە ئاسمانەکان و زەمین هەیە هەمووی سەربازو موڵکی خوایەو خوای گەورە چۆنی بیەوێت دەتوانێ بەکاری بێنێت، چۆن دەریای بە ڕووی موسا شەقکرد و نەهەنگی بۆ یونس کردە پەناگەو ئاگری کردە خانەدانی ئیبراهیم، بۆ خوای گەورە زۆر ئاسانە پێغەمبەریش (ﷺ) ئاوا بپارێزێت.

٢- خوای گەورە پێغەمبەری لە کاتی کۆچدا پاراست، کاتێك لە ژوورەوە هاتە دەرەوە هەموان خەویان لێکەوت، بەڵام ئایەتەکە باسی ناو ئەشکەوتەکە دەکات لەو کاتەی کە ئیمامی ئەبوبەکر زۆر ترسا، خوای گەورە پاراستی.

بەڵام ئیسلام وەك هەمیشە مسوڵمانان لەسەر ژیانی

هۆکارەکـان بە پشتبەسـتن بە خـوا رادەهێنێـت. خـوای گەورە هاوشـێوەی ئیسـڕاو میعـراج راسـتەوخۆ پێغەمـبەری (ﷺ) لە مەکـکەوە نەبـردە مەدیـنە. بەڵکـو بەجۆرێـك بـوو خـوودی پشـتیوانییەکە دەرسـێکە بـۆ مسـوڵمانان لەوەی چـۆن دەتـوانن سەرکەوتن وەچنگ بێنن، ئەو ئامادەسازی کرد، لە (خواردن و وڵاخ و رێگـۆڕین و مـانەوە لە ئەشـکەوت) و هەمـوو شـتێکی کـرد، ئینجـا لە نـاو ئەشـکەوتەکە بـوون کە خـوای گەورە فریشـتەی پـارێزەری بـۆ نـاردن و چـاوی دوژمنـانی لـێ دوورخستەوەو ئارامی خستە دڵیانەوە.

کەواتە: دەبـێ مسـوڵمانانیش هەر ئـاوا بیـر لە پشـتیوانی خوایی بـکەنەوە، ئامادەسازی هەمەگیر بـکەن و پشت بە خوا ببەسـتن، چـاوەڕێ نەکەن بە تەمبەڵـی و گـوێنەدان بە هـیچ، ئەوجا فریشتەی خوایی بێن ببنە سەربازیان.

٣- بـۆ شـەڕی تەبـوکیش خـوای گەورە بەبیـر بـاوەڕدارانی دێنێـتەوە، هەڵسـتنە سـەرەخۆو بچـنە مەیـدانەوە، ئەگەر وانەکەن، ئەوە بۆ پێغەمـبەر (ﷺ) ئاسـاییە کە خوای گەورە چۆن لەوێ فریشـتەی نـاردو پێغەمـبەری لە نـاو ئەشـکەوتەکە پاراسـت، بە هەمان شێوە لێرەش دەیپارێزێت، چونکە خوا بەڵێنی پاراستنی بە پێغەمبەرەکەی داوە.

بەڵام ئایـا مەبەسـت لە ئـایەتەکە ئەوەیە فریشـتەکان وەکـو سەرباز بێن؟

بێگومان نەخێر، بەڵکو گرداان و هاندانی مسوڵمانانە تا دەست بدەنە خۆیان و سست و تەمبەڵ نەبن.

دوو ئایەتی پێش ئەوە هەر زۆر بە روونی دەفەرموون: پێویستە ئێوە هەڵبستن و تەمبەڵ نەبن، کە ئێوە تەمبەڵن چاوتان لە دونیایەو قیامەتتان وەلاوە ناوە، لە کاتێکدا دونیا لە ئاست قیامەت هیچ نییە.

بەم حاڵەش کە دوژمن تەنگتان بۆ بێنێت و ئێوەش نە باتان بێت و نەباران، ئەوا مەددەدی ئیلاهی بۆ ئێوە نایەت، بەڵکو ﴿يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ﴾ [التَّوبَة الآية ٣٩]. واتە: "خوا سزایەکی ئێش پێگەیەنەرتان ئەداو، دوژمنیش زاڵ ئەکات بەسەرتانا، ئێوە لادەباو خەڵکێکی تر دەخاتە جێگاتان".

کەواتە کە پێغەمبەر (ﷺ) بەخۆش لەناویان بووە، خوای گەورە نەیکردە عادەت ئەوان پاڵ بدەنەوەو ئەویش سەریان بخات، بەڵکو تێیگەیاندن ئەنجامی سستی و تەوەزەلی ئێوە، سەرکەوتنی دوژمنان و زەلیل بوونی ئێوەیە. ئینجا ئێوە نامێنن و خەڵکێکی دیکە جێتان دەگرێتەوە.

بە هەمان شێوە خوای گەورە لە شەڕی بەدر فریشتەکانی ناردنە خوارەوە بۆ پشتیوانی پێغەمبەر (ﷺ)، وەك دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ﴾ [آل عِمْرَان من الآية ١٢٣ الى الآية ١٢٤].

واتە: "بێگومان خوا لە غەزای بەدردا سەرکەوتوی کردن، هەرچەندە ئێوە (لە ژمارە و چەکدا) لاوازو کەم بوون، دەی کەواتە لە خوا بترسن، بۆ ئەوەی سوپاسگوزار بن * (یادیان بهێنە) کاتێک بە ئیماندارانت دەوت: ئایا ئەوەندە بەس نیە کە پەروەردگارتان بە سێ هەزار فریشتە کۆمەکتان بکات و دایانبەزێنێت؟!".

لێرەش فریشتەکان هاتوونە، بەڵام وێڕای ئەوەی کە هۆکارەکان تا ئاستێك هەبوونە وەك پێشتر باسمان کرد بەتایبەتی لە رووی ئامادەسازی مەعنەوی و ستراتیژییەتی شوێنەکە.

لە هەمان کاتدا لە ئایەتەکەدا خوای گەورە ناوی شوێنی سەرکەوتنەکەی بردووە کە (بەدر)ە، دیارە ئەمەش بۆ پێغەمبەری خوا موعجیزەی ئەو کاتی بووە، وەك ئیبن عاشوور دەڵێت: "لێرە باسی ئەو کاتە کراوە کە رۆژی بەدرە، چونکە کاتی دەرکەوتنی ئەم موعجیزەیە بووە".

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە موعجیزەیە، لە موعجیزەشدا هەموو یاساکان دەشکێن، کەچی ئەمە بەو رەهاییە نییە، بەڵکو دەبینین جبرائیل مەزنی فریشتەکان هاتۆتە خوارەوە، مەگەر نەدەکرا خوای گەورە هێزێکی وای پێبدات بە جارێك دوژمنان لەناو ببات، چ پیویستی بە سێ هەزار فریشتە هەبوو؟

لەوەدا ئیبن حەجەر قسەیەکی جوانی تەقیەدینی سوبکی دەگوازێتەوە دەڵێت: "پرسیارم لێکرا چ حیکمەتێکی تێدایە ئەو

فریشـــتانە شـــان بە شـــانی پێغەمـــبەری خـــوا (ﷺ) بجەنگـــن لەكاتێكدا جوبرائیل دەیتوانی بە یەك لابالێیەوە كافرەكان وەلاوە بنێت، جا منیش گوتم: بۆئەوەی بوو تا سەركەوتنەكە ببێتە كـاری پێغەمـبەرو هـاوەڵانی، هـاتنی فریشـتەكانیش تەنیـا بەهانـاوەچوونێكی شـێوەی بەهانـاوەچوونی لەشـكرەكان بێـت لە شێوەی هۆكارەكان و ئەو یاسایانەی خوای گەورە بۆ بەندەكانی داناوە، لە راستیشدا خودا بكەری هەموویە".

كەواتە لێرەدا فریشتە هاتوون وەكو شوێنێكی تایبەتی، بەڵام بۆئەوەی باوەڕداران رێكـارو ئەسـبابەكان بگـرنە دەست، خوودی موعجیزەكەش لە شێوەی ئەسباب و هۆكارو ئەنجام دەركەوتووە. نـابێ مسـوڵمانان بە خەیـاڵی مـوعجیزەی خـاریق بێخەم دانیشـن، ئەگەرچی بۆ خوا هیچ شتێك مەحاڵ نییە، هەربۆیە لە شەڕی ئوحود وێڕای ئەوەی پێغەمـبەر (ﷺ) لەگەڵ مسـوڵمانان دابـوو، كەچی مـوعجیزەكە نەهـات، هۆكـارەكەش دیـارە مسـوڵمانان لە بەدردا هەمـوو هۆكارەكانیـان گـرتەبەر، بەڵام لە ئوحـود دوور لە هۆكارەكان مامەڵەیان كرد، كە پێشتر روونمانكردەوە، ئەوەبوو لە شـار هـاتنەدەرەوە، چیایەكەیـان بەجێهێشـت، تەمـاحی پاتـاری گۆڕەپانی جەنـگ ئامـانجەكەی لەبیر هەنـدێكیان بـردەوە، بۆیە مـوعجیزەكەش نەهـات، كەواتە هەتـا ئەگەر پێغەمـبەر (ﷺ) خۆشـی لەگەڵ دابووبێـت بەبـێ گـرتنەبەری هۆكارەكـان

موعجیزەکە هەر نەهات، بۆیە لە ئایەتی پاشتر دەفەرموێت:

﴿بَلَىٰٓۚ إِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأۡتُوكُم مِّن فَوۡرِهِمۡ هَٰذَا يُمۡدِدۡكُمۡ رَبُّكُم بِخَمۡسَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ﴾ [آل عِمْرَان الآية ١٢٥].

واتە: "بەڵێ ئەگەر خۆڕاگر بن و پارێزکار بن هەر ئێستا دێن بۆ لاتان و پەروەردگارتان پێنج هەزار فریشتەی نیشانەدارتان بۆ ڕەوانە دەکات، بۆ ئەوەی کۆمەکیتان بکەن".

ئیمامی ڕازی لەسەر ئەوە دەفەرموێت: "هاتنی پێنج هەزار فریشتە وابەستەی سێ مەرج کرد: (ئارامبگرن، خۆپارێزبن، دەستبەجێ کافرەکان بێنەوە)، جا کە مەرجەکان نەهاتنە جێ، ئەوانیش نەهاتن". دیارە باسی ئارامگرتن و خۆپارێزی جەنگە، کە ڕێکارە پێویستە سەربازییەکانیش دەگرێتەوە.

بە کورتی خوای گەورە موعجیزەکەشی، وەکو وانەیەك دایە پێغەمبەرو بەرچاوروونییەکی باشی مسوڵمانان بوو تا لە مانای سەرکەوتن و دوژمن بەزاندن تێبگەن.

### سێیەم: باو باران

لە شەڕی ئەحزابدا هەرچی هێز هەیە بەرۆکی مسوڵمانانی گرتبوو، قورەیش لە دەرەوە، جوولەکەو مونافیق لە ناوەوە، چ بە شەڕ یان بە پڕوپاگەندەو ترساندن، قورەیش بە هەموو هێزەوە هاتووە دەیانەوێ شاری مەدینە بگرن و کۆتایی بە کیانە

بچووكەكەی مسوڵمانان بێنن. لە ژوورەوەش جولەكەو دووڕووەكان هەرچی لە دەستیان هات درێخیان نەكرد بۆ ترساندنی مسوڵمانان و خێزانەكانیان. ئینجا بە پێشنیازی سەلمانی فارسی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی كرد چاڵێك لە دەوری مەدینە لێبدەن، خۆشی بەشداری هەڵكەندنەكەی كرد. لەو بەرەشەوە سەربازەكانیان شمشێرو تیرو رم بەدەست وەستابوون، كاتێك كافرەكان دیتیان سەریان سووڕما، چەند رۆژێك مانەوە نەیانتوانی بچنە ژوورەوە، نیمچە تیرهاوێشتن و شەڕ روویدا، بە هەرحاڵ دەرفەتی چوونە ناو شاریان نەبوو. دواتر لە شەوێكدا بایەك هات ترسێكی زۆری لەناو لەشكری قورەیش بڵاوكردەوە، هەروەك فریشتەكانیش هاتن سنگی خێوەتی قورەیشییەكانیان لەبن دەرهێنا، ئا بەم جۆرە ترس گرتنی و هەڵاتن.

ئەمە موعجیزەیەك بوو بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات، بەڵام مانای وا نییە مسوڵمانان چاوەڕوانی شتێكی وەهابن، چونكە یەكەم ئەو پێغەمبەر بوو، خوای گەورە یاساكانی بۆ دەشكاند، دووەم بناغەی ئیسلام بوو، لە ناوچوونی ئەوان نەمانی ئیسلام بوو، كە ئێستا بە هیچ شێوەیەك وەها نییە.

هەروەها وێڕای ئەوەش پێغەمبەر (ﷺ) لە رووی هۆكارەكانەوە بە تەواوی خۆی ئامادە كردبوو، وەك: ((بۆ

بەرگریکردن لەشکری هێنا لێواری مەدینە، چاڵێکی گەورەی لێدا، پشتی چاڵەکەی بە سەربازەکانی دەپاراست، لە گەرمەی رۆژە ناخۆشەکاندا وەك هەوڵێکی دیپلۆماسی، هەوڵیدا هاوپەیمانی جوولەکەو قورەیش هەڵوەشێنێتەوە، کەسێکی قورەیشی بەناوی (نەعیمی کوڕی مەسعوود) تازە مسوڵمان ببوو، پێغەمبەر (ﷺ) ناردییەوە ناو لەشکری دوژمن، پێی فەرموو: تۆ لێرە تاکە کەسێکی هیچت پێناکرێت، بڕۆ لە ریزەکانی ئەوان چەندی دەتوانی دووریان بخەوە، هەموو ئەوانەی توانای شەڕیان نەبوو لە ژن و منداڵ و پیاوە بێتواناکان لە قەڵایەکی تایبەتی حەشاردان بۆ پاراستنیان، هاندانی شاعیرەکان بۆ بەرزکردنەوەی وورەی مسوڵمانان و ترساندنی دوژمنان، دوعاو پاڕانەوەی بە کوڵ و گوڕ))، هەموو ئەو رێکارانەی گرتنەبەر، ئینجا دوای چەند رۆژێك ئەو موعجیزەیە هات، لێرەوە قسەکەی پێشوو دووبارە دەکەینەوە: (بۆچی لە جەنگی ئەحزاب و بەدر فریشتە هاتن، بەپێچەوانەوە لە ئوحود نەهاتن!).

کەواتە: ناکرێ مسوڵمانان وەها خەیاڵی بیربکەنەوە، کە هەریەکەیان بەبێ هیچ پێشکەوتنێکی زانستی و نوقمی پەرتەوازەیی و نەزانی، ئەوجا هەر نەخۆشییەك هات بە سەربازی خۆیانی بزانن.

## ئایا ئەو سزایانە دووبارە دەبنەوە؟

پێشتر روونمان کردەوە، خوای گەورە یاسا جێگیرەکانی گەردوونی بەشێوەیەك داناون هەمووی بە هۆکارو دەرەنجام بەستۆتەوە، بۆیە کاتێك ئەسکەندەر دەستی دەگاتە حوکمڕانییەکی زۆر، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا﴾ [الكهف الآية ٨٤] .

واتە: "بەڕاستی ئێمە هێزو دەسەڵاتمان لە زەوییدا پێدا، وە لە هەموو شتێك کە پێویست بوو هۆکارو ئامڕازەکەیمان بۆ ڕەخساند".

لەم ئایەتە پیرۆزە فێردەبین کە سەرکەوتنی هەر گەل و نەتەوەیەك بە ئامرازەکانەوە بەندە، بۆیە ئیسلام هەمیشە دەستگرتن بە ئامرازەکان و پشتبەستن بە خوا پێکەوە دەبەستێتەوە، ئامرازەکان لەبەرئەوەی گرتنەبەری رێکارە خواکردەکانە لە یاساکانی ژیاندا، پشتبەستنیش لەبەرئەوەی بکەری راستەقینە هەر ئەوە.

بەڵام بۆ پێغەمبەران ئاساییە کە خوای گەورە توانای ئەوەیان بداتێ ئەو یاسایانە بشکێنن، ئەمەش وەك پێشتر باسمانکرد بۆ سەلماندنی کاری پێغەمبەرایەتیان، کەچی زۆربەی موعجیزەکانیشیان لە رووکەشدا لەشێوەی هۆکارەکان

دێنە بەرچاو، دەبینین حەزرەتی ئەیوب ئاوی وەکو هۆکارێك بەکارهێنا بۆ شیفابەخشین.

بەتایبەتی موعجیزەکانی پێغەمبەرمان (ﷺ)، ئەگەرچی هەندێکی هەبوون هیچ هۆکاری نەبوو وەك ئیسراو میعراج و خودی قورئان، بەڵام موعجیزەکانی هاتنی سەرکەوتن لە گۆڕەپانی ژیان هەموویان لە شێوەی گرتنەبەری هۆکارەکان دەردەکەوتن. بەڵام دەبێ مسوڵمانان دڵنیابن ئەوان پێغەمبەر نین تا موعجیزەیان بۆ دەرکەوێت، بەڵکو تەوفیقی خوایی لەناو گرتنەبەری هۆکارەکان و پشت بەخوابەستن دێت، چونکە خوای گەورە یاساکانی بۆ خاتری چاوی رەشی مسوڵمانێکی خەمساردی خۆپەرست ناشکێنێت.

ئێستا با نموونەیەك بێنینەوە، خوای گەورە باسی ئەوانە دەکات کە بێفەرمانی خوایان کرد، خوای گەورە لەناوی بردن، ئینجا خەڵکێکی دیکە هاتۆتە جێگای ئەوان و ئێستا لەوێ دەژین، ئەوان شوێنەواری گەلە لەناوچووەکان دەبینن، کە بەهۆی گوناهو تاوانەکانیان لەناوچوون (پێشتر روونمان کردەوە گوناهـ چەند جۆرو شێوازی هەیە)، ئینجا هۆشدارییان دەداتێ کە چۆن لە خۆیان ئەمین دەبن کە لەپڕێکا ئەوانیش تووشی هەمان چارەنووس ببن، ئەمەش هەمووی بۆ بەخۆداچوونەوەی مسوڵمانان و جێگای پەندوەرگرتنە، ﴿فَأَهْلَكْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ﴾ [الأنعام الآية ٦]. واتە: "ئینجا بەهۆی تاوانەکانیانەوە قڕمانکردن و لەناومان بردن".

﴿كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ [الأحقاف الآية ٢٥]. واتە: "ئاوا پاداشتی هۆزە تاوانکارەکان ئەدەینەوە".

﴿وَضَرَبۡنَا لَكُمُ ٱلۡأَمۡثَالَ﴾ [إبراهيم الآية ٤٥]. واتە: "نموونە و باسی زۆرمان بۆ هێناونەتەوە (دەربارەی سەرئەنجامیان)".

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ﴾ [طه الآية ١٢٨]. واتە: "ئا لەو بەسەرهاتانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ خاوەن بیرو هۆشمەندەکان".

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍۚ أَفَلَا يَسۡمَعُونَ﴾ [السجدة الآية ٢٦]. واتە: "بەڕاستی ئا لەو دیاردانەدا گەلێ بەڵگەی زۆر بەهێز هەیە بۆ دەسەڵاتی ئێمە، دە ئایا نابیسن؟".

ئینجا خوای گەورە رووی قسەکانی دەکاتە هاوبەشدانەرەکانی مەککە، بۆئەوەی بەراوردی حاڵی خۆیان بکەن لەگەڵ نموونەکانی دیکەی قورئان، ئایا ئەوان ئەمینن کە عەزابی خوای گەورەیان بۆ بێت لە کاتی نووستنی شەوێ، کاتی چێشتەنگاو، دیارە (وەك ئیبن عاشوور) دەڵێت: ئەو عەزابەی کە هۆشداریان دەداتێ هەمان عەزابی خەڵکی گوندەکانە کە پێشتر لە ئایەتی (٩٤)ی سووڕەتی ئەعراف باسی کردووەو بریتییە لە ﴿بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ﴾ (هەژاری و لاتی و نەخۆشییە). هەروەها لەبەر هەمان هۆکاری خەڵکەکەشە کە ئەوانەش وەکو ئەوانی پێشوو پێغەمبەریان بەدرۆ زانیوە، واتە

پەیامی پێغەمبەریان بە روونی بۆچووە بەڵام بەدرۆیان خستۆتەوە.

لێرەدا پرسیارەکە ئەوەیە: چۆن گەلانی پێشوو پێغەمبەرانیان بەدرۆخستەوە، عەرەبەکانیش بەتایبەتی ئەوانەی ئایەتەکەیان دەرهەق دابەزیوە کە قورەیشن، بە هەمان شێوە پێغەمبەریان بەدرۆخستەوە، بەڵام ئایا چۆن بەڵای گشتی هاتە سەر ئوممەتانی پێشوو، بۆ قورەیشیەکانیش بە هەمان شێوە هات؟ خوای گەورە دوای ئەوانە یەکسەر دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَهْدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ أَهْلِهَآ أَن لَّوْ نَشَآءُ أَصَبْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْۚ وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ﴾ [الأعراف الآية ١٠٠].

واتە: "ئایا دەریشنەکەوت بۆ ئەوانەی دێن بەدوای دەستەو چینەکانی پێش خۆیان پاش لەناوچوونی ئەوانەی کە تیایدا نیشتەجێ بوون کە <u>ئەگەر بمانویستایە، ئەوە بەهۆی گوناهەکانیانەوە تووشمان دەکردن</u> (وەک چۆن خەڵکانی پێش خۆیانمان لەناو برد)و مۆرمان دەنا بەسەر دڵەکانیاندا، جا ئەوان نابیستن".

جا ئەگەر دیقەت بدەینە ئایەتەکە، هێنانی بەڵای سەر قورەیشی بە فەرمانی رابردوو (الماضي) هێناوەو دەفەرموێت: ﴿أَن لَّوْ نَشَآءُ <u>أَصَبْنَٰهُم</u> بِذُنُوبِهِمْۚ﴾، بە واتای لە رابردوودا ئەگەر بمان ویستایە هەمان شتمان بەسەر دەهێنان، بەڵام بەسەرمان نەهێنان.

ئەوەش وەك ئیـــبن عاشـــوورِ دەڵێـــت: لەبەرئەوەیە کە خـــوا نەیویستووەو مەشیئەتی لەگەڵدا نەبووە، بەڵام دەبێ بترسن کە بۆ خوا ئاسانە لە داهاتوو بەسەریان بێنێت.

کەواتە بۆ دەسەڵاتی خوا ئاسانە، بەڵام لە سەردەمی خودی پێغەمـــبەر (ﷺ) رووی نەدا وێـــڕای ئەوەی ئـــازارو مەینەتـــی زۆری بە دەست کافرەکانەوە چەشت، بەڵکو خوای گەورە زیاتر هۆشداری دەدانێ بە سزای دوارۆژ، چونکە دونیا شوێنی سزاو پاداشت نییە، بەڵکو شوێنی تاقیکردنەوەیەو قیامەتیش شوێنی سزاو پاداشتە، خوا نەیکردۆتە یاسای ژیان کە هەر کەسێ تـــاوانێکی کـــرد یەکســـەر ســـزای لـــێ وەرگـــرێتەوە، بەڵکـــو دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ﴾ [إبراهيم الآية ٤٢].

واتە: "هەرگیز تۆ وا بیر مەکەرەوە کە خوا لە کاروکردەوەی ستەمکاران خافڵ و بێ ئاگابێت، نەخێر، بەڵکو بە هەموو کارێکیـــان زانـــاو ئاگـــادارە، بـــەڵام بۆمـــاوەیـــەك مۆڵـــەتیان دەدات، پاشان دەیانگرێ و تۆڵەیان لێدەسێنێت، بۆ ئەو رۆژە دوایان دەخاو دەیانهێڵێتەوە کە ئەوەندە سەختە گشت چاوێك لە ترسانا ئەبڵەق دەبن و، لە بزووتن دەکەون".

بەڵام دەکـــرێ خـــوا لە دونیـــاش ئەو ســـزایە ببارێنێـــت وەك دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُوا۟ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا

مِن دَآبَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّىۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًا﴾ [فاطر الآية ٤٥].

واتە: "خۆ ئەگەر خوا تۆڵەی لە خەڵكی بسەندایە لە سەرەنجامی كارو كردەوەی نادروستیاندا، هەرچی زیندەوەر هەیە لەسەر ڕووكاری زەوی نەدەما، بەڵام خوا ئەوەندە بەپەلە نیە لە تۆڵەسەندن، بەڵكو دوایان دەخات بۆ كاتێكی دیاریكراو، جا كاتێك ڕۆژی خۆی هات، بێگومان ئەو كاتە خوای گەورە بینایە بە بەندەكانی (كارو كردەوەیانی هەموو لەبەردەست دایە)".

بە گوێرەی ئەم ئایەتە خوای گەورە بە زۆری وایە سزاكانی بۆ قیامەتێ هەڵدەگرێت، ئەگەر هەركەسەو تاوانێكی كرد خوا تۆڵەی لێ بسەنێتەوە، كەس لەسەر زەوی نەدەما، جاروباریش هەر لە دونیا سزایان دەدات، بەڵام سزاكە لە خودی كارە خراپەكانیانەوە دروست دەبێت، واتە چ شتێك بەكاردێنی سزاكە لەوەوە دروست دەبێت، چونكە خوای گەورە سوننەتی ژیان بەو گوێرەی دایناوە نایگۆڕێت، بۆنموونە كاتێك ریباو سووخۆری دروست دەبێت، سزایێك لە خودی كارەكە دروست دەبێت، كاتێك تاقیكردنەوەی ڤایرۆسێكی كوشندەی زیانبەخش دروست دەكەن، ئەوا سزایەكە لە خودی ڤایرۆسەكە دروست دەبێت، ئەوە سزای تاقیكردنەوەی ڤایرۆسەكەیەو ئەوەی دی سزای سووخۆرییە.

ئەویش سزای یەكجارەكی نییە، بەڵكو دەرگایەكە بۆئەوەی لە خراپەكە بگەڕێنەوەو دەكرێ چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە، ئەمیش تەنیا لەبەر سزادان نییە، بەڵكو بۆئەوەشە یاساكانی ژیان بێنەوە سەر ڕێچكەی خۆیان، بەتایبەتی كاتێك كارەكانی مرۆڤ دەبنە مایەی نەخۆشی و ئازارو مەینەتی بۆ مرۆڤایەتی، وەك پێشتر باسمان كرد لە شرۆڤەی ئایەتی ﴿ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ [الرُّوم الآية ٤١]).

كەواتە: ئەوە سزای راستەقینەی خۆیان نییە، بەڵكو بۆئەوەیە لە كارە خراپەكانیان بگەڕێنەوەو چیتر تەنگەبەری بۆ مرۆڤایەتی دروست نەكەن، جا ئەگەر لەو هەوڵە قێزەونانەیان گەڕانەوە ئەوە مرۆڤەكان جۆرە حەسانەوەیەكیان دێتەوە بەر، سزای خۆشیان ئەگەر تۆبەیان كرد ئەوە باشە، ئەگینا بۆ قیامەتێ هەڵدەگیرێت.

ئەوە تێگەیشتنێكی دروست نییە كەسانێك پێیان وابێت بەهەمان شێوەی رابردوو بەڵاكان لە دەرەوەی كاری مرۆڤەكانەوە دروست ببنەوە، وەك ئەوەی لەبەرامبەر زوڵمیان خوای گەورە موعجیزەیەك بنێرێت و یاساو رێساكانی بشكێنێت و نەخۆشییەكی گشتی بێنێتە سەریان.

## ئایا کۆرۆنا تۆڵەی ئیگۆرەکان بوو؟

بەشێکی بانگخوازان پێیان وابوو: ئەوە تۆڵەی خوایە دژی چینییەکان لەبەر ئازاردانی مسوڵمانە ئیگۆرەکان. دڵنیام تاکو ئێستا وەڵامەکەت وەرگرتووە، بەڵام بۆ روونکردنەوەی زیاتر بەدیاریکراوی تیشك سەر ئەو تێگەیشتن و بڕیارە، کە پێویستی بە کۆمەڵێك شت هەیە:

**یەکەم:** دەبێ دڵنیابین ئەوجا بڕیار بدەین، بۆنموونە:سزاکانی ئوممەتانی پێشوو لە رێگەی قورئان و وەحییەوە دڵنیابووین کە تۆڵەیە، بەڵام لەوەدا هیچ دڵنیاییەکمان نییە. بۆیە ئەو بڕیارەی بە گەرم و گوڕی درا پێویستی بە پێداچوونەوە هەیە.

**دووەم:** دەبێ پەیوەندی نێوان رووداوەکان و دەرکەوتنی کۆرۆنا بزانین، واتە ئایا ئەوانەی دەستیان لە تاوانەکە هەیە، هەمان ئەو کەسانەن کە تووشی کۆرۆنا بوونە، ئایا هەمان ئەو سەرۆک و فەرماندەو سەربازانەن کە دەیانکوژن و دەیانچەوسێننەوە، چونکە لە هەموو نموونەکانی پێشوو کە قورئان باسیکردوونە هەمیشە کەسە زاڵمە سەرەکییەکانی وەك فیرعەون و عادو سەموود و نەمروود بوونەتە قوربانی، بگرە هەر نازانین چ پەیوەندییەك لەنێوان شاری (ووهان) و (ئیگۆرەکان) هەیە.

**سێیەم:** ئایا کۆرۆنا لە بن دەستی ئەوانە دەرچوو کە

تاوانبـاری جەنـگ بـوون، چـونکە تـا ئێسـتا نـازانین پەیوەنـدی تەواوی لە چییەوە.

**چوارەم:** ئایا تۆڵەی خودا هەر هێندە بوو، کۆمەڵە کەسێکی کوشـت کە لەوانەیە هـیچ پەیوەنـدیان بەو باسـەوە نەبـووە، ئینجـا دەوڵەتەکە بەهێزتـر لە جاران لە باسـەکە دەرچـوو، هەنـدی ئێسـتا خەڵکـی دیـکە دەناڵێنێت ئەوان تـاکو ئێسـتا گـرفتەکەیـان هێنـدە گەورە نیـیە، بگـرە رۆژانە چـین دەمامـک و پێداویسـتییەکان وەکو بازرگانی بە وڵاتانی دونیا دەفرۆشێت.

**پێنجەم:** بۆچی دەبێ خوای گەورە تۆڵەی تاوانی زاڵمەکـان، لەو منداڵ و ژن و بێتاوانانە بکاتەوە کە لەوانەیە هیچ خەبەریـان دەربارەی ئەو شـوێنەش نەبێت، مەگەر هەمـوو ئەو نموونـانەی لە پێشـــەوە باســـمان کـــرد، ئەوانە نەبـــوون کە خـــوا تـــۆڵەی لە ستەمکاران دەکردەوە لە بەرامبەر ستەمەکانیان.

**شەشەم:** ئایـا ئەو کۆرۆنـایە بە چ پێوەرێك دەبێتە سـەربازی خوا، کە دەرگای ماڵی خواو هەموو شوێنێکی داخستووە، تۆ لە دینەکـانی دیـکە بـگەڕێ، ئایـا بـۆچی ئەو سـەربازانەی خـوا یەخەی ئەو ژنە مسوڵمانە دەگرن کە لە مەقدۆنیا هەڵاتـووەو لە ئیتاڵیا نەشتەجێیە، خانەوادەکەی بۆ یەك هەفـتە تەرمەکەی لە ماڵەوە لەبەر چاوانەو شوێنێك نییە لێی بشارنەوە، بۆچی یەخەی کـۆمەڵە مسـوڵمانێکی پابەنـد لە لەنـدەن دەگرێـت، بـۆچی لە

ڕۆژێکدا (٥٥) مسولمان لە نیۆیۆرک دەکوژێت.... مەگەر نافەرمووێت: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ [الإسراء الآية ١٥]. واتە: "کەس گوناهی کەس هەڵناگرێت، کەس بەرپرسیار نیە لە هەڵەی کەسانی تر".

ئەو بەڵێنەی خوا بەشێوەیەکی گشتی بۆ قیامەتە، بەڵام بۆ دونیاش دەبێ وەك چۆن لە شەڕی بەدر کاتێك سزای خوای گەورە هات کۆمەڵی کافرەکانی لەناوبردو مسولمانانی رزگارکرد. بەڵام لەو نەخۆشییەدا مسولمانانیش بوونەتە قوربانی.

**حەوتەم:** لە هەموو ئەو شوێنانەی سەربازانی خوا هاتوونە، مسولمانانی ڕاستەوخۆی ناو گرفتەکە سوودمەندی یەکەم بوونە، لە شەڕی بەدر ئەوان سەرکەوتن، لە شەڕی خەندەق ئەوان لە چنگی کافرە ئابلوقەدەرەکان رزگار بوون، بەڵام لەو ڕووداوە ئیگۆرەکان چ قازانجێکیان کرد، ئایا رزگاریان بوو؟

ئایا توانیان دەوڵەتێکی سەربەخۆ دروست بکەن؟

ئایا چین ناچاربوو داوای لێبووردنیان لێبکات و وەکو فیرعەون لە سەرەمەرگدا بڵێت: تۆبە ئەوە باوەڕم هێنا، نەك هەر ئیگۆرەکان بگرە هیچ وڵاتێك لە ئەنجامی ئەو ڤایرۆسە گەیشتە قەناعەت بڵێت ئەوە زوڵمی ئێمەیە لە مسوڵمانان و خوایە هەقیان لە ئێمە دەکاتەوە.

**هەشـــتەم:** ئایـــا چینییەکـــان دەزانـــن ئەو بەڵایە تـــۆڵەی تاوانەکەیانە، چونکە کاتێك خوای گەورە تۆڵە دەنێرێت، پێشتر هۆشداری دەداتە کەسە ستەمکارەکە، وەك هەمـوو پێغەمـبەران هۆشداریان دایە ستەمکارەکان، بۆئەوەی دواجار بگەڕێنەوە، ئایا چـین بە جۆرێـك لە جۆرەکـان لەوە تێـدەگەن، کە ئەوە تـۆڵەی خوایە، بۆئەوەی تۆڵەکە بەرهەمەکەی وەرگرێتەوە.

**نۆیەم:** ئایا مسوڵمانان بە ئەرکی دروستی خۆیـان هەڵسـتاون، پەیامی جوانی پێغەمبەریان (ﷺ) بە چاکی گەیاندۆتە شاری ووهـانی چـین، ئینجـا ئەوان کەلەرەقـانە دژی وەسـتابنەوە، تـا هەموو بەهانەو عوزری چینییەکان ببڕن بەرامبەر خودا، ﴿رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ [النِّسَاء الآية ١٦٥]

واتە: "پێغەمبـەرانمان (ڕەوانـە کـردووە) کـە مـژدەدەرن (بـە ئیمانـداران) و ترسـێنەرن بـۆ (یاخیـەکان)، تـا خـەڵکـی هـیچ بـەڵگـەیـەکیان بەدەسـتەوە نـەمێنێت (لەسـەر بێ دینـی و یـاخی بوونیـان) دوای ئـەوەی خـوا پێغەمبـەرانی بـۆ ڕەوانـە کـردوون، بێگومـان هەمیشـەو بـەردەوام خـوا باڵادەسـت و دانایـە". ئایـا بە چاکی پێغەمبەریان ناسی: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾ [الإسْرَاء الآية ١٥].

واتە: "ئێمـەش سـزای کەسـمان نـەداوە تـا پیغەمبـەرێکی بـۆ دەنێرین".

**دەیەم:** کە تۆڵەی راستەوخۆی خودایە[1] تەنیا یەك رێگای چارەسەری هەیە، ئەویش تۆبەو پاڕانەوەیە لە خوا، هەموو هەوڵێکی زانستی سوودی نییە، پێویست ناکات ئەو هەموو هەوڵ و خۆپارێزییە بگیرێتەبەر، بۆیە با رەورەوەی زانست پەکبێخین، لە جیاتی داخستن با رووبکەینە مزگەوت و کڵێساکان، چونکە ئێمە دەزانین تۆڵەی خوایە بۆ رووداوێکی دیاریکراو.

**یازدەم:** ئایا مسوڵمانانی ئیگۆر هەموو رێکارو هۆکارەکانی یاسای ژیانیان گرتۆتەبەر، کە خوا دایناوە، لەوەی چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەم رووداوانە بکەن، وەك تێگەیشتن لە خوودی دۆزەکەو پەیوەندی نێودەوڵەتی و ئامادەسازی مەیدانی، وەك ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بەدرو حونەین و خەندەق کردی، تا تەنیا مەددەدی خوایی مابێت.

هەروەها چەند خاڵێکی دیکەشی بۆ زیاد دەکەین:

**دوازدەهەم:** ئێمە بەو تێگەیشتنە دەرگای رق و کینە دەکەینەوە، کە بەداخەوە دوای ئەم قسانە خەڵکێکی زۆر لە خوودی ئایینەکەمان پرسیاری بۆ دروست بووەو خودا وەکو کەسێکی تۆڵەستێنی ناهەق دەشوبهێنن.

**سێزدەهەم:** لە مێژوودا دەبینین پێغەمبەری خوا (ﷺ)

(١) نەك بەو شێوەی باسمان کرد کە هۆکارو دەرەنجام بێت.

هەمیشە لە هەقی خۆی خۆش بووە، کاتێك فەتحی مەککە دەکات لێخۆشبوون بۆ دژوارترین دوژمنەکانی دەردەکات، ئەوانەی جەرگی حەمزەی مامیان بە تازی لە مەیدانی جەنگ قووت دا، ئەوانەی ئەو و هاوەڵانیان بە هەموو شێوەیەك ئازاردا، دەربەدەریانکردن، نوێنەریان نارده حەبەشە بۆئەوەی پەناگەی ئەوێشیان لێ تێکبدەن، پەیوەندیان لەگەڵ هەموو زاڵمانی دونیا کرد بۆئەوەی لە بنیان بێنن.

کەسانێکی ئەوەندە قێزەونیان تێدا بوو کە لێخۆشبوونی مەککەش نەیگرتنەوە، کەچی دواتر عەفووی کردن. دوای ئازاردانی تائیف دەستەکانی بەرزدەکاتەوە تا خەڵکەکە لەناونەچن بەڵکە لە پشتیانەوە کەسێکی باش دەربچێت، ئەوە ئەو ئیسلامەیە پێویستمان بە گەیاندنی هەیە، کە رەحمەتە بۆ هەموو کەس.

**چواردەم:** دەبێ مسوڵمانان مێشکی خۆیان بکەنەوە بۆ ململانێکانی دونیا، خوای گەورە لەو دونیایە موعجیزەیان بۆ ناخوڵقێنێت تا چاوەڕێ بکەن بەو حاڵە شڕەی ئێستاکەوە ببنە رابەر، خوای گەورە ژیانی لەسەر بنەمای هۆکارەکان دامەزراندووە، ئەگەر بیگرنەبەر خوای گەورە بەرەکەتی تێدەخات، ئەگینا هیچ بە هیچ ناکەن. با چاوەڕێ نەبن بێنە سەر حازری و ببنە رێبەرو پێشەنگی دونیا.

لەم کتێبەدا کۆمەڵە نموونەیەکمان هێنایەوە، بەڵام بۆ

دووپاتکردنەوە حەزدەکەم ئەوە بەبیرخۆمان بێنینەوە، کە خوای گەورە گەردوونی لەسەر کۆمەڵە یاسایەکی جێگیر داناوە، ئەو یاسا جێگیرانەش بۆ کەس ناگۆڕێت ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا﴾ [الفتح الآية ٢٣]، واتە: "هەرگیز نابینیت بەرنامەو یاسای خوا گۆڕانی بەسەردا بێت".

تەنیاو تایبەت بۆ پێغەمبەران گۆڕانیان بەسەر هاتووە، ئەوەی پێغەمبەرانیش زۆربەی لەشێوەی هۆکارو دەرەنجام بووە، هەربۆیە مەدەدو پشتیوانی خوایی لە بەدرو حونەین دێت، چونکە هۆکارەکانیان گرتبووەبەر، لە ئوحود نەهات، چونکە گرنگیان بە گرتنەبەری هۆکارەکان نەدا، ئەمەش ئەو دەرسە بوو خوای فێری کردن. هەروەها نموونەی نەخۆشکەوتنی حەزرەتی ئەیوب، کاتێك نەخۆشکەوت بە فەرمانی خوا ئاوەکەی وەکو گرتنەبەری هۆکارێکی چارەسەر خواردەوە، خوای گەورە لەناو ئاوەکە شیفای بۆ نارد[1].

---

(١) خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَآ أَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِنُصۡبٖ وَعَذَابٍ ۝٤١ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَۖ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ ۝٤٢﴾ [ص من الآية ٤١ الى الآية ٤٢]. واتە: "ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سەر گوزەشتەی بەندەی ئێمە - ئەیوب- یان بۆ باس بکە، کاتێك بانگی لە پەروەردگاری کردو وتی: بێگومان شەیتان توشی نەخۆشی و ئازاری کرووم. پێمان وت: دەپێی خۆت بکوتە بە زەویدا برۆ، ئەمە ئاوێکی خۆشگەواری فێنك و بەکەڵکە، بۆ خۆشۆرین و خواردنەوە، واتە: لێی بخۆرەوەو خۆیشت تێیدا بشۆ، پاشان ئەویش خۆی تیا شۆری و، لێی خواردەوە، ئەوجا خوای دلۆڤان شیفای داو نارەحەتییەکەی لەسەرهەڵگرت".

بۆیە مسوڵمانان دەبێ بڕوامان وابێت خوای گەورە لەناو هۆکارەکان سەرکەوتنمان بۆ دەنێرێت، ئەمەش وەك سوننەتی ژیان بەگوێرەی یاسا نەگۆڕەکانی خوا، ئەگینا ئەگەر خوا شیفای تێنەکات هۆکارەکان هیچیان لە دوو نایەت، هەروەها بۆ خوا ئاسانیشە بەبێ هۆکار.

خوای گەورە نموونەی سەرکەوتن و دەسەڵاتیش هەر بە هۆکارەکان دەبەستێتەوە، وەك لە باسی زولقەرنەین فەرمووی: ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَءَاتَيۡنَٰهُ مِن كُلِّ شَيۡءٖ سَبَبٗا ﴿٨٤﴾﴾ [الكهف الآية ٨٤].

واتە: "بەڕاستی ئێمە هێزو دەسەڵاتمان لە زەویدا پێدا، وە لە هەموو شتێك کە پێویست بوو هۆکارو ئامرازەکەیمان بۆ ڕەخساند".

کەواتە بۆ باوەڕداران سەرکەوتنی خوایی لە ناو گرتنەبەری هۆکارەکان دێت، چونکە خوا ئەوەی کردۆتە یاسای نەگۆڕ، بۆیە بەرلەوەی بیر لەوەی بیر لە تۆڵەی خوایی بکەنەوە، پێویستە بیر لەخۆیان بکەنەوە، ئایا شیاوی ئەوەن سەرکەوتنی خواییان بۆ بێت، ئایا هۆکارەکانیان کە هەوێنی ڕەحمەت بن، شەڕو ئاشتیان، پێشکەوتن و سەرکەوتنیان، زەنگین و گوزەرانیان، هەمووی بە ئامانجی ئاسوودەیی جیهان بێت. کەواتە تاکە ڕێگەی هەڵستانەوە گرتنەبەری هۆکارەکانە بە پشتبەستن بە خوا.

با نموونەیەکتان بۆ بگێڕمەوە: ساڵی (٢٠١٢) لە جەزائیری پایتەختی جەزائیر بەشداری کۆنفرانسێکی زانستیمان کرد، بەشێك لە میوانانی کۆنفرانسەکە باسی پاشەکشێی ئەمریکایان دەکرد، پێیان وابوو شارستانی رۆژئاوا بە ئەمریکاو ئەوروپا بەرەو کۆمەڵە گرفتێکی گەورەی ئابووری و سیاسی و ئەخلاقی و... دەبێتەوە، ئەمانەش نیشانەی کەوتنی ئەو شارستانییەن، یەکێکی دیکە لە میوانەکان، کە کەسێکی مسوڵمانی بە رەگەز ئەڵمانی و نیشتەجێی ئەڵمانیا بوو، بەشداری گفتوگۆیەکەی کردو قسەیەکی ئەقڵانی کرد، گوتی: ئێوە وەها باسی رووخانی شارستانی رۆژئاوا دەکەن، کە راستەوخۆ مسوڵمانان جێگیرن، بەڵام لەبیرتان نەچێت، جیهانی ئیسلامی هیچ کاتێك هێندەی ئێستا وێران نەبووە، بۆیە ئەگەر ئەوان لە پاشەکشێ دابن، ئەوا بەدیلی ئەمریکا لەوانەیە چین بێت، کە خۆی لە هەموو ئاستێك ئامادە دەکات، بۆیە بەر لەوەی بیر لە رووخانی ئەمریکاو ئەوروپا بکەنەوە، با مسوڵمانان ناو ماڵی خۆیان چاك بکەن، ئەوجا خۆیان بۆ جێگرتنەوە ئامادە بکەن.

ئەو قسەیە تەواو دروست و واقیعییە، ئاخر مسوڵمانان ئێستا لە کوێی دونیا دانەو چەندە لە رووی هۆکارەکانەوە ئامادەسازیان کردووە تا مەددەدی خواییان بۆ بێت، ئێستا لەسەر ئاستی دەوڵەتان هەموویان دوژمنی یەکن، هەر یەکەو

ژێردەستەی وڵاتێکی (نامسوڵمانە)، هەندێك روویان لە ئەمریکاو ئەورووپایە، هەندێکی دیکە لە چین و روسیایە، ناعەدالەتی لە ناو وڵاتانی مسوڵماننشین گەیشتۆتە چڵەپۆپە، گەل و نەتەوەکان بۆ پلە یەك و دوو ریز دەکەن، لە ڕووی عەدالەتی کۆمەڵایەتییەوە جیاوازی ئاسمان و رێسمان هەیە، بە پیتترین سەرخاک و ژێرخاکیان هەیە، بەڵام هەموو وڵاتانی دونیا پێی خەنی بوون، کەچی گەلەکانیان لەژێر نیرو ئامووری هەژاریدا دەناڵێنن. لە رووی پێشکەوتنەوە ئەو پارەی بۆ پێشکەوتنەکان خەرج دەکرێت هیچ بەراورد ناکرێت لەگەڵ ئەو پارەی لە شتی بێمانا بە هەدەر دەدرێت. ئەو کوشتوبڕەی لە ناو مسوڵمانان هەیە لە هیچ شوێنێکی دیکە نییە، کەس ئامادە نییە بە زاڵم بڵێت بوەستە بەتایبەتی لەسەر ئاستی دەوڵەتەکان، هەر لایەنەو پشتیوانی هاوئایدۆلۆژیای خۆی دەکات، چاو لە زوڵمەکەشی دەنووقێنێت، لە ڕووی ئایینیشەوە برایەتی لە هەموو شتێك غائیبترە، بەهەشتمان لەسەر فیرقەیەك تاپۆ کردووە، لە کەمترین دەرفەت دەگەڕێین تا یەکتر بشکێنین، بە ئاشکرا یەکتر تەکفیرو تەفسیق دەکەین،... بە کورتییەکەی کە ئێمە لە هیچ ئاستێکدا رێکارەکانمان نەگرتوونەتەبەر، چۆن چاوەڕوانی ئەوە بکەین پشتیوانی خواییمان بۆ بێت.

**چواردەهەم:** تینووبوون بۆ تۆڵە خەونی تەمبەڵانەو

بێچارەکانە، مرۆڤە تەمبەڵەکان حەزیان لێیە دابنیشن، خوای گەورە تۆڵەیان بۆ بکاتەوە، دواییش کە گرفتێکی وەها روویدا دەست لەسەر چۆک دابنێن تا چارەسەر دەبیت. بەپێچەوانەوە پێویستە لەو خەوە هەڵستینەوە، لە شوێنی ململانێ برایەتی بچێنین، لە شوێنی دواکەوتن زانست بچێنین، لە شوێنی هەژاری زەنگینی بچێنین، لە هەموو ئاستێکدا پشتیگری پێشکەوتنی وڵاتمان بکەین.

**پازدەهەم:** ئەو رووداوانە دەرفەتی زێرینن بۆ پیشاندانی میهرەبانی خودایی، دابنیشین دوعای خێر بکەین، داوای لێبووردن و هاوکاری بکەین، خەریکی هاندان بین بۆ دۆزینەوەی رێگەچارەی زانستی، دەنگ و سەدای مزگەوتەکانمان میهری ئەو خودایە بگەیەنێت کە دەستپێکی هەموو سوورەتەکانی بە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ دەکاتەوە، نەك وەك کەسانێك هەتا ڤایرۆسەکە لە چین بوو، لێرە پاڵەوانێتیان دەفرۆشت و بە سەربازەکانی خوایان دەشووبهاند، کاتێك یەخەی هەموو دونیای گرت و هیچ دین و نەتەوەیەك لێی دەرنەچوو، نەیانزانی چۆن باری خواریان راست بکەنەوە. دیارە مەبەست شکاندنەوەی ئەو بەرێزانە نییە، بەڵکو هەندێکجار ناچارین بۆ چارەسەری، دەرمانی تاڵیش بخۆینەوە. لە دنیای نوێدا دەبێ خوای گەورە وەکو ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ بناسێنین، کە هەموان

هەست بە میهرەبانی و بەخشندەیی بکەن، هەموان هانا بۆ باوەشی میهرەبانی و رەحمەتی مزگەوت و دڵی باوەڕداران بێنن. بۆنموونە بۆ یەکەمجار لە بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیا رێگەدرا بانگی ئیسلام بە ئاشکرا بدرێت، کە فرمێسکی لە چاوی مسوڵمانان باراندو سەرنجی هەموو خەڵکە نامسوڵمانەکەشی راکێشا، دواتر لە ئەمریکاو کەنەداو ئیسپانیا، باشە ئەگەر ئەوانە بزانن ئەوە تۆڵەو رقی خوایە، دەبوو چ وەڵامێکیان هەبوایە، یان دیمەنی ئەو دوو منداڵە یەك ساڵ و حەوت ساڵییەی ئەمریکا کە دایبابیان بە کۆرۆناوە مردبوون و دەستی بۆ ئەستێرەکان درێژدەکرد کە دایبابی چوونەتە ئەوێ، جووڵەکانی بە جۆرێك بوون دڵی هەموو مرۆڤێکی شەق دەکرد، کە گەورە بوو بزانێ دایبابی مردوونە بە دەردێك کە خوای مسوڵمانان لە تۆڵەی مسوڵمانانی ئیگۆر بەری داوەتە دونیا، چ هەستێکی دەبێت؟!. ئێستا کە خەریکی .نووسینەوەی ئەم دێرانەم چین بووەتە فریادڕەسی هەموو دونیا بە هاوکاریکردنیان لە رێگەی تیمی تایبەت و ناردنی پێداویستی پزیشکی بەتایبەتی دەمامک.

ئێستا لە هەواڵێکدا کونسوڵی گشتی ئەڵمانیا لە هەولێر کە وڵاتەکەی رۆژانە سەدان قوربانی مردن و هەزاران تووشبوو دەدات، سەردانی وەزیری تەندروستی کردووەو هاتوونە هاوکاری هەرێمی کوردستان دەکەن، دەیان پزیشکی سعوودی لە نەمساو

سویسرا هاوکاری پێشکەشی ئەو وڵاتانە دەکەن، تورکیا هاوکاری دەنێرێتە وڵاتان، بۆیە ناکرێ ئەوان ببنە فریادڕەس و هاوکار خەڵکە دیندارەکەش خەریکی ئەقڵییەتی تۆڵەکردنەوە بین. با ئیسلامە ڕەحمەتەکە بە دونیا بناسێنین، ئەزموونی رابردوو سەلماندی، لەسەر ئاستی دەعوەو بانگەوازدا تاکە ڕێگە زمانی مەرحەمەت و میهرەبانییە، هەموو ئەو ئەقڵیەتانەی خەریکی رەتکردنەوەی ئەوانی دیکەبوون، دواجار نەك قازانجیان نەبوو بەڵکو بوونە بارێکی قورس بۆ سەر ئیسلام و مسوڵمانان، مێژوویەکی دەوێت تا هەڵەکانیان راست دەکرێنەوە. با ئیش بۆ بنیادنان و بەهێزکردنی دەوڵەت بکرێت، کە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی ئەو شەرە بکات، با نەیکەینە بار بەسەر مزگەوت و میحرانەوە.

**شازدەهەم:** ئێستا لەسەر ئاستی جیهان ژمارەیەکی زۆری مسوڵمانان هاوکارن بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکانی کۆرۆنا، بۆنموونە چوار یەکەم پزیشك کە لە پێناوی بەهاناوەچوونی خەڵکی نەخۆش لە بەریتانیا بوونە قوربانی، مسوڵمان بوون. چەندان گەورە سەرمایەدارو پزیشك و زانای گەورە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی هاوکارن بۆ چارەسەری ئەم نەخۆشییە، ئەوە سەرباری ئەو خەڵکانەی لە وڵاتە مسوڵمانەکان کاردەکەن، خۆزگە ئەو بەرێزانەی خەریکی بیرکردنەوەی تۆڵە دەبوون سەرنجی خەڵکیان لەو رووداوە بۆ ئیسلام رادەکێشا، بۆئەوەی

هەمووومان وەکو ئەرکێکی ئەخلاقی دەستمان لە چارەسەرکردنی گرفتەکانی جیهان هەبوایە.

**حەڤدەهەم:** خۆزگە لە کاتی ئەم رووداوە بیرمان لەوە دەکردەوە چۆن پەیامی پیرۆزی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) بە قسەو بە بەرجەستەکراوی کردارەکانمان بگەیەنینە ئەو خەڵکەی کە ئیسلام ناناسن، بیرمان لەوە بکردبایەوە چۆن دەبینە هەوێنی گەیاندنی پەیامی ئیسلام بە (چین)ی شیوعی و (ئەوروپا)ی مەسیحی، چۆن تێیان بگەیەنین ئێمە خاوەن چ پەیامێکی میهرەبانین، ئایا بۆ رۆژی دوایی هیچ وەلامێکمان بەدەستە بۆ بینینی رۆڵی ئیجابی گەیاندنی ئیسلام بەو وڵاتانە، خۆزگە هەندەی خەممان گەیاندنی پەیامی مەرحەمەتی ئیسلام دەبوو، هێندە بیرمان لە تۆڵەکاری نەدەکردەوە. خۆزگە بیرمان لەوە دەکردەوە لێرەو لە وڵاتی خۆمان، لە قسەو گوفتار، لە کارو کردار، لە مامەڵەو بازرگانی، لە دەمەتەقێ و گفتوگۆدا، ئیسلامی مەرحەمەتمان لەخۆدا بەرجەستە دەکرد.

**هەژدەهەم:** ئەو کاتەی ڤایرۆسی کۆرۆنا یەخەی جیهانی ئیسلامی گرتەوە، زانایان و شارەزایان هیچ دوودڵ نەبوون لە داخستنی مزگەوت و شوێنە پیرۆزەکان، بە مەککەو مەدینەشەوە، هەموو رێکارە زانستی و تەندروستییەکانیان بە دەقە ئیسلامیەکان پشتڕاست دەکردنەوە، هەر لە کەرەنتینەوە

بگرە تا دەگاتە دابڕاندن و پاکوخاوێنی و داخستنی مزگەوت و گەڕان بە دوای دەرمان و چارەسەر، ئەوانە بەجۆرێك کاریگەری هەبوو کەسێکی مەسیحی ئەمریکی هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرا بەناوی (کرەیج کۆنسیدن) بابەتێکی دوورودرێژی بەناونیشانی (ئایا هێزی نوێژ بە تەنیا دەتوانێ پەتا رابگرێت؟ موحەمەد رایەکی دیکەی هەبووە) لە گۆڤاری (نیوزویك) لە (٢٠٢٠/٣/١٧) بڵاوکردەوە، کە سەرنجی هەموو دونیای بۆ ئیسلام و رێنماییەکانی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) راکێشا.

ئەو هەڵوێستەی زانایان و خانەکانی فەتوا و دەزگاکانی لێکۆڵینەوە، بۆ هەموو دونیایان سەلماند پاراستنی گیانی مرۆڤ لە ئیسلامدا چ پێگەیەکی گەورەی هەیە، سەلماندیان ئیسلام هەمیشە پشتیوانی زانستە، دنیا هەتا پێشبکەوێت ئیسلام لەگەڵی دەڕوات، بۆیە هەر بە زیندوویی دەمێنێتەوە، چونکە گەورەترین پانتایی داوەتە (زانست، ئەقڵ، ئەخلاق).

خۆزگە چۆن دام و دەزگا گەورەکان و زۆرینەی مەلاو بانگخوازان لەو ئاستە بوون، ئاوا تەواوی بانگخوازان و مسوڵمانانیش لەو ئاستەدا دەبوون، ئیسلامیان وەکو خۆی بە دیوە جوانەکەوە دەگەیاند، کە خۆی ببینێتەوە لە ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾ [الأنبياء الآية ١٠٧]

واتە: "ئێمە هەر بۆیە تۆمان نارد کە رەحمەت و بەزەیی و

میهرەبانییەك بێت بۆ هەموو جیهانیان تا دەستیی تەواوی مەردوم بەرەو هیدایەت و ڕێگەی بەختیاریی بگرێ"، ئامانجیشی بریتی بێت لە ﴿إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِىٓ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾ [هود الآية ٨٨]

واتە: "هەتا بشتوانم هەر چاکسازیی و، ڕێکوپێککرنی حالّی ئێوەم دەوێت، ئەمەوێ ئێوە دەسپاك و دادگەربن. خۆ تەوفیق و دۆزینەوەی ڕێی ڕاست و هیدایەتیشم تەنها بەخوایە، پشتم بەو بەستووە و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێمەوە".

بە کردەیی هەموو هەوڵێکمان دابا بە ئامانجی ئاوەدانی دونیاو گەڕانەوە بۆ خواو پشت بەستن پێی.

## ئەی چۆن لێکی بدەینەوە؟

بۆئەوەی بتوانین لەم رووداوانە تەندروست دەربچین، دەبێ واز لەوە بێنین کە کارەکانی خوا بە حەزی ئێمە بێت، لەوانەیە کەسێك بە خراپی بزانین و حەز بە لەناوچوونی بکرێت.

بەڵام لە راستیدا خێرێکی گەورەی هەڵگرتبێت، هەروەها ناکرێ رووداوەکانیش چۆنی پێمان خۆشە تەفسیر بکەینەوەو کەفی دڵمانی لێ هەڵرێژین، دواتر لەوانەیە هەمان ئەو رووداوە بەپێچەوانەوە بێتەوە، وەك ئەو نەخۆشییە، کە سەرەتا جۆرە تەفسیرێکی بۆ دەکرا، دواتر بەشێوازێکی دیکە هاتەوە، کەسێکی عەرەب (نەمزانی پزیشکە یان بانگخواز، چونکە شێوەی هەردووکیانی دەدا) لە ڤیدیۆیەکدا باسی ڤایرۆسی کۆرۆنا دەکات، دەڵێ ئەوە سەربازی خوایە بۆ چینییەکان و دڵخۆشە پێی، کەچی کە یەخەی وڵاتەکەی دەگریت، دەڵێ: واجبە بکوژرێت چونکە ئەوە بکوژ و قاتیلە.

پاشان ئێمە لە ئیشی خوا نازانین کە بە دیاریکراوی چ حیکمەتێکی تێدایە، کاتێك یوسف کەوتە دەستی براکانی و فرۆشتیان، هەموان کردیانە شین و گرین، یاقووبی باوکی لە هەموان بە کوڵتر دەگریا، کەچی دوای چل ساڵ دەرکەوت بەرنامەی خوا چۆن بووە، ئەو گەشتە پڕ ئازارەی یوسف بووە

لەبنهێنانی بتپەرستی و رزگارکردنی خەڵك لە قاتی و قڕی و چەسپاندنی دادگەری، ئەوانە ئیشی خوای گەورەن بۆ بەندە بزرن. وا چاترە واز لەوە بێنین ئەوە تۆڵەی خودایيە، یان سزایەکی دوژمنکارانەیە، دەترسم خەڵکانێك هەبن لەگەڵ کۆتاهاتنی ئەم پەتا جیهانییە خراپتر بێنەوە مەیدان و هیچ کەڵك لەو تاقیکردنەوە گەورەیە وەرنەگرن، کەواتە پێویستە کارێك بکەین هەموومان بە جیاوازی دین و زمان و جوگرافیاوە سوودمەند بین، با زیاتر بە دیوی پەندو ئامۆژگاری و بەشداری ئیجابی کارا مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، کاری خوا بەجۆرێك نییە بە ئەقڵی بچووکی ئێمەمانان لێکبدرێتەوە. مرۆڤەکان تەنیا مامەڵە لەگەڵ دیوە ئاشکراو دەرەکییەکەی دەکەن، بەگوێرەی سوننەتی خوایی لە ژیاندا هەوڵی خۆیان دەدەن و هۆکارەکان دەگرنەبەر، لە چارەسەری و دۆزینەوەی دەرمان و هەڵێنجانی پەندو ئامۆژگاری و دۆزینەوەی خاڵە لاوازو بەهێزەکان لەسەر ئاستی دەوڵەت و حکومەت و تاک و خێزان، بەڵام ئەو ئەنجامە مەزنە چی دەبێت کە لە دەرەوەی توانای مرۆڤەکانە، ئەوە کاری خوایەو خۆی بازاڕی خۆی دەسووڕێنێت.

ئێمە ئەوەمان لەسەرە ئیجابیانەو لە ئاست گەورەیی خوا، تەفسیرو لێکدانەوەی بۆ بکەین، ئەو خوایەی هەوڵی کەس بۆ دونیا یان بۆ ئاخیرەت بە خەسارەت نادات و هەموو کەسەکان

بەری رەنجی خۆیان دەدوورنەوە، مولحیدێك هەوڵی ژیانی خۆی بدات، باوەڕدارێك کار بکات، ئاژەڵێك بەدوای قومە ئاوێك بگەڕێت، ... رەحمی خوا بەشی هەموویان دەکات.

جا بۆئەوەی لێکدانەوەیەکی واقیعی و دروست بۆ ئەم رووداوە گەورانە بکەین، پێویستە لە سەرەتاوە گومانی باش بە خوا ببەین، بە شێوەی تێگەیشتنی خۆمان یان هەندێك کتێب کە لێکدانەوەی کەسەکانن پێناسەیەک بۆ خوا نەدەینە خەڵك، خوا بە خاوەن و پەروەرێنی گەردوون بناسێنین، ئەو خودایەی هەمیشە رەحمەتی لە پێش سزاکەوەیە، وێڕای خراپی مرۆڤەکان بەڵام ژیان تێك نادات، تەواوی ئەم جیهانەی خستۆتە بەر دەستی مرۆڤ، لەگەڵ هەمووشیان میهرەبان و بە رەحمە، ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ وَٱلْفُلْكَ تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ وَيُمْسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٥﴾﴾ [الحج الآية ٦٥].

واتە: "ئایا بە چاوی خۆت نەتبینیوە چۆن خوای گەورە هەرچی لە زەویدا هەیە بۆ ئێوەی ڕام هێناوە، هەروەها کەشتیەکانیش کە لە دەریاکاندا دەڕوات بە فەرمانی ئەو زاتە، ئاسمانیش ڕاگیر دەکات لەوەی کە بکەوێت بەسەر زەویدا مەگەر بە ویست و فەرمانی خۆی، بەڕاستی خوا بۆ خەڵکی زۆر بەسۆزو میهرەبان و لێخۆشبوو بەخشندەیە".

ئەو هەمـوو میهرەبـانییە زۆرە لە پەنـای چەنـد نمـوونەیەکی عەزاب بزر نەکەین، بۆیە باشترە لەم جۆرە رووداوانە بڵێین:

**یەکەم:** بەو پێـیەی لە روانـگەی ئیسـلامەوە ژیـان هەمـووی تـاقیکردنەوەیە، ئەوەش تـاقیکردنەوەیەکی گەورەیە رووبەڕووی تەواوی مرۆڤـایەتی بـوەتەوە، هەریەکەو بە ئاسـتی خـۆی، هەر وڵاتەو بە قەبارەی خۆی دەکەوێتە ژێر تاقیکردنەوە، هەمووشمان کە لەنـاو کەشـتییەکە دایـنە تووشـی ئـازارو مەینەتییەکـانی دەبیـنەوە، بەو پێـیەی هەمووومـان یەك چارەنووسـمان هەیە، نـابێ هیچ کەسێك بێخەم دانیشێت و چاوەڕێی ئەوەی دیکە بکـات، هەر لایەو بەگـوێرەی توانـا کـار بـۆ کەمکـردنەوەی ئازارەکـان بکات.

**دووەم:** ئەو رووداوە وانەیەکـی پەروەردەیـیە تـا هەمووومـان بەخـۆدابچینەوە لە چـۆنیەتی مامەڵەکردنمـان لەگەڵ (خـوا، مرۆڤەکان، ژینگە، زانست، ...).

کـاتی خـۆی، کاتێـك زاڵمێـك سـنوورەکانی دەبەزانـد و قەبارەی خۆی لە ئاستی خودا نەدەناسی، پێغەمبەران بە پەیامی خواییەوە دەهاتنە لایان، وشیاری و بێداریان دەدانـێ، موعجیزەیان وەك ئاوێنەیەك پیشان دەدرا تـا لاوازی خۆیـان بزانن، دەرەنجام لە هەڵەکە بگەڕێـنەوە، ئێسـتا لەو سـەردەمەی دوای پێغەمـبەران شـتێك نەمـاوە بەنـاوی مـوعجیزە، رووداوە سرووشـتیەکانی وەك

بورِكان و بوومەلەرزەو لافاو و... هەرچەندە حیكمەتی گەورەی دیكەی لە پشتە كە نایزانین و كەسانێكی زانا بەشێكی دەزانن، هەروەها ئەو نەخۆشیانە وێرای ئەوەی نەخۆشیگەلێكن لەوانەیە دەرەنجامی كاری مرۆڤەكان خۆیان بێت، بەڵام دەركەوتنیان بەو هێزەوە، كە هەندێك لە توانای مرۆڤبەدەرن هەندێكیشیان سەخت و ماندووكەرن، وەكو (نیمچە) موعجیزەی هۆشداریدانە مرۆڤ تەماشا دەكرێت، بە مەبەستی بێداری و وشیاربوونەوە لەو دۆخەی تێیكەوتوونە، بۆنەوەی چۆن موعجیزە هیچ پاساوێكی بەدەست زاڵمان و گوناهبارانەوە نەهێشت، بوونە مایەی گەڕانەوەی خەڵكێكی زۆریش، ئەوانەش بە هەمان شێوە هۆشداری و ئاگاداركردنەوە.

بۆنموونە: ئێستا لە رووداوێكی وەهادا قەبارەی خۆمان بەرامبەر خوای گەورە ناسی، جیهان لە كاتێكدا تووشی دەستەوەستان بووە، كە زانست لە لوتكەدایە، مرۆڤ لە رووی زانستی و تەكنەلۆژیاوە هێندە گەورە بوو، غروور بە تەواوی دایگرتبوو، پێیان وابوو ئەوان گەورەو سەرداری رەهاو بێچاودێری گەردوونن، بێجگە لە مامەڵەی ئەخلاقی و ئابووری و كۆمەڵایەتی، تاقیكردنەوەی ناشیاویان لەسەر مرۆڤ دەكرد، رەگەزی مرۆڤەكانیان دەگۆڕی و شانازیان بە كوشتنی كۆرپەدەكرد بەبێ هیچ پاساو و كۆت و بەندێك، كەچی ئێستا

ئەو وڵاتـــانەی لە ڕووی زانســـتییەوە پێشـــەنگن، زیـــاتر ئەو نەخۆشییە یەخەی گرتوونەو ڕۆژانە چەندان هەزار كەس دەبنە قوربانی، تـا ئێستاش چارەسـەرێكی خێـرا نەدۆزراوەتەوە. ئەمە تێمـان دەگەیەنێـت، كە زانسـت هەرچەنـدە پێشـكەوێت، مـرۆڤ هەرچەندە بەهێز بێت، بەڵام ڤایرۆسێكی بچووكی بەچاونەبینراو تـا ئاستێك چۆكی پێداوە، ئیدی هەمیشە بەرامبەر خـوا بە لاوازی دەمێنێتەوە، لەوانەیە بە كەمترین ڕووداو پەكی بكەوێت، بۆیە كاتێك ئەم ڕووداوە تێدەپەڕێت، ئومێدەوارین لەو غـرووریيە بێینە خـوارەوەو هەمیشە هەست بە چاودێری خـوایی بكەیـن، بۆئەوەی لە ڕووی ئەخلاقییەوە سنوورەكان نەبەزێنین، بەتایبەتی تـاڵانكردنی سـامانی وڵاتە هەژارەكـان و جۆرەهـا هاوسەرگیری قێــزەون و چەوســاندنەوەی خەڵكــی بێــدەرەتان و بێدەســەڵات، بەكارهێنانی زانست بۆ كاری دژەمرۆیی، تێكدان و مـامەڵەی ناتەندروســـت لەگەڵ ژیـــنگە، دانـــانی پلەبەنـــدی نەتەوەیـــی، چەوسـاندنەوەی خەڵكـی كرێكـارو موحتـاج... گەڕانەوە بـۆ مامەڵەی دروست لەگەڵ ژینگەو كەمكردەوەی هەڕەشە گەورەو بچووكەكـانی سـەر ژیـنگە، زانسـت بـۆ خزمەتـی مـرۆڤ بەكاربێت، ڕەچاوكردنی ئەخلاق لە تـاقیكردنەوە زانستییەكان و پەرەپێـدان، .... ئەهـا خـوای گەورە چـۆن باسـی ئەوەمـان بـۆ دەكـات كە توانـای هەیە لە هەر لایەكەوە سـزاتان بـۆ بنێرێـت

(پێشـــتر روونمـــان کـــردەوە ســـزای خـــودایی چـــۆن هەڵقـــوڵاوی کارەکـــانی مرۆڤەکـــانە) ئەمەش بـــۆئەوەی لە دەرەنجـــامی کارەکانیان تێبگەن و بگەڕێنەوە، دەفەرمووێت: ﴿قُلْ هُـوَ ٱلْقَـادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُـمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْـضٍۗ ٱنظُـرْ كَيْـفَ نُصَرِّفُ ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ﴾ [الأنعَام الآية ٦٥].

واتە: "پێیان بڵێ: هەر ئەو زاتە بەتوانەیە و دەتوانێت سزای سەختتان لە سەروتانەوە بۆ بنێرێت یان لە ژێر پێتانەوە یاخود بتانکاتە دەستە دەستە و پارچە پارچە و تاڵاوی توندو تیژی هەندێکتان بکات بەگەرووی هەندێکی ترتاندا، تەماشا بکە چۆن چەندەها بەڵگەی جۆراو جۆریان بۆ دەهێنینەوە، بۆ ئەوەی ئەوان تێبگەن".

**سێیەم:** خوای گەورە بەرامبەر بەندەکانی خۆی بە رەحم و میهرەبانە، وەك دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّـاسِ لَـرَءُوفٌ رَّحِـيمٌ﴾ [البَقَرَة الآية ١٤٣]. واتە: "بێگومانە کە خوا بەرامبەر بە خەڵك زۆر میهرەبان و دڵاواو بەبەزەییە".

بـۆیە ئەو تـاقیکردنەوانە بە هـیچ شـێوەیەك بە تـۆڵەو سـزای خـراپ لێکنـادەینەوە، بەپـێچەوانەوە کاتێـك بە کـارێکی خـراپ هەڵدەستین، خـوای گەورە دەرەنجامی هەڵەکانمـان پیشـان دەدات بۆئەوەی لە هەڵەکان بگەڕێینەوە، ئەمەش هەر رەحمەتە ﴿كَتَـبَ

رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ أَنَّهُۥ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءَۢا بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ [الأنعام الآية ٥٤].

واتە: "پەروەردگارتان فەرزی کردووە لەسەر خۆی (کە لە ئاقاری ئێوەدا) بە رەحم و میهرەبان و دلۆڤان بێت، ئەگەر کەسێکتان بە نەفامیی، بە نەزانیی گوناهێکی کردو لەوەودوا تەوبەی کردو پەشیمان بۆوە و پاش ئەنجامدانی خراپەکە و چاکسازی کرد، ئەوە با دڵنیابێت کە پەروەردگار زۆر لێخۆشبوو و میهرەبانە".

کەواتە باشترە لە کارەکانمان بگەڕێینەوەو بە چاکەکاری قەرەبووی بکەینەوە. بۆیە ئەم نەخۆشییە دەرەنجامی کردارەکانی خۆمانە (جا لەسەر ئاستی کۆمەڵ و دەوڵەت یان تاك) کارێکی وەها کراوە ئەو دەرەنجامە قورسەی لێکەوتۆتەوە. باشترین شت ئەوەیە مرۆڤەکان لەو کارانە بگەڕێنەوە، تۆبە لە دووبارەکردنەوەی ئەم هەنگاوە وێرانکارانەو نادادگەری و وێرانکاری و شەڕی خۆسەپاندن بێنن، چونکە کاتێك لەسەر خراپە بەردەوام دەبین، ئەگەر خۆشییەکی کاتیشی تێدا بێت، بەڵام دواجار ئازارێکی وەها دێت هەموومان دەگرێتەوە، بەپێچەوانەوە ئەگەر بە جوانی و رەشیدییەوە مامەڵە بکەین ئەوە دەرگای خێرو بێری ئەو دونیایە بەسەر هەمووماندا دەکرێتەوە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْـَٔايَٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا﴾ [الإسراء الآية ٥٩].

واتە: "ئێمە بۆ ترس وەبەرنان، نیشانەکان وەرپێدەکەین". بەو ئومێدەی هەرکەسەو بە قەد دەستڕۆیشتنی خۆی، ترس بیگرێت و کارەکەی لە دژی مرۆڤەکان بەکارنەهێنێت.

**چوارەم:** ئەم رووداوە فێری کردین گرنگیدان بە زانست کاری هەرەپێویستی کۆمەڵگەیە، ئێستا وڵاتان ئەو هەموو داهاتەی لە ئامێرەکانی چاوچنۆکی و مرۆڤکوژی خەرج دەکەن، لە جۆرەها چەکی مەترسیدار و زیانبەخش، ئەگەر پێکەوە بۆ بواری زانستی دابنێن، لە بری ژینگەپیسکردن، دەرمانی سوودبەخشی بۆ دابنێن، هاوسەنگی نێوان بوونەوەران رابگرن، پەرە بە جۆرەها دەرمانی پێویست بدرێت، رەچاوی دادگەری کۆمەڵایەتی بکرێت، ئەوا جیهان دەچێتە دۆخێکی دیکەی جیاوازی بەهەشت ئاسا، کەواتە وەك چۆن سوار تا نەخلیسکێ نابێتە سوار، با ئەم کەتنەش دەروازەیەك بێت بۆ پێشکەوتنی زیاتری زانستی بەتایبەتی بواری پزیشکی، کە ئەنجام دەروازەیەکی دیکەی گەورەی خزمەتی مرۆڤایەتی دێتە کایەوە.

لە هەمان کاتدا دەزانین زانست هەرچەندە پێشکەوێت، ئەگەر بە بەرگی رەوشت و ئەخلاق سنوورەکانی نەپارێزرێن، بەدبەختی بۆ مرۆڤەکان دێنێتەوە، لەوانەیە شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم ڤایرۆسە لە بنەڕەتەوە رەچاوی ئەخلاقی تێدا نەکرابێت، هەر لە پێدانی زانیاری و سووکایەتی و بێڕێزیکردن و بە کەم

تەماشاکردنی ئەوانی دیکەو، بەکارهێنانی وەکو تۆڵە، ئاخر کاتێك خەڵکی شارێك حەز بکەن شارەکی دیکە زیاتر ئەو نەخۆشییەی لێیە، یان وڵاتێك لە بینینی ئەو دەردە لە وڵاتێکی دیکە تووشی دڵگوشادی بیت، یان لەسەر بنەمای حزب و عەشیرەت و نەتەوە هەندێك چاویان لە وێرانبوونی ئەوانی دیکە بێت، ئەوە لوتکەی دارمانی ئەخلاقە، بەڵام ئەوە تەنیا لە بڵاوبوونەوەی ڤایرۆس نییە.

راستە لاوازی ئەخلاقی کەسانێك لەو ڤایرۆسە جوانتر دەرکەوت، بەڵام مەگەر پزیشـــــکێك، ئەنـــــدازیارێك، کیمیاگەرێك،.... دوکاندارێك، بازرگانێك، فەرمانبەرێك، حزب و حکومەت و خەڵکێك، کۆمپانیاو کارگەیەک، مامۆستا و پارێزەرو دادوەرو مەلاو قەشەو مالمێك، فرۆشیارێك، زانکۆو قوتابخانەو پەیمانگایەک، کرێکارو وەستایەك... چەندە لە کارەکانیان رەچاوی ئەخلاق دەکەن، تا ببنە مایەی رووناکی بۆ خەڵك. ئایا چەندە لە رووی ئەخلاقییەوە دەبینە سەرچاوەی ئومێدو رووناکی بۆ جیهان.

**پێنجەم:** لە هیچ رووداوێکدا نابێ تووشی بێ هیوایی و ئومێدبڕاو بین، چونکە خوا هیچ دەردێکی بێ دەرمان نادات، بەڵکو بۆ خوا ئاسانە بە چرکەساتێك کۆتایی پێ بێنێت، بەڵام خوای گەورە سووننەتی ژیانی وەها داناوە ئەنجامی کارە

خراپەکانمان بچنینەوە، تا لەوێوە دەست بە هەنگاوی باش بکەین و بەرهەمی باش وەدەست بێنین، بۆیە دەبێ هەنگاوە زانستیەکان بگیرێنەبەرو دوعای تەوفیق و سەرکەوتن و شیفابەخشینیش لە خوا بکەین.

وەکو مسوڵمان تێگەیشتین کە کۆمەڵە پرسێك هەن لە ئیسلامەوە گرنگی زۆری پێدراوە، بەڵام لەبەرئەوەی رۆژانە لەگەڵی راهاتووین هەستیان پێناکەین، بۆنموونە بابەتی پاکو خاوێنی و دەست شۆردن، ئەوە کەسانێك هەبوون گاڵتەیان پێدەکرد، دەیانگوت بۆچی فلان مەلایە لە وتارەکانیدا باسی ئەو شتانە دەکات، بەڵام ئێستا بەدیار کەوت چ رێکارێکی گرنگن بۆ خۆپاراستن لە چەندان نەخۆشی، بە هەمان شێوە خواردنی گۆشتی پیس و مردارو حەرام، نوێژو چوونە مزگەوت هێزێکی زۆری مەعنەوی و جەستەیی دەداتە نوێژخوێنان بەتایبەتی بەساڵاچوان پڕ ئومێد دەکات. بە کورتی ئەم رووداوە بۆی دووپاتکردینەوە کە ئیسلام جوانترین یاساو رێسای واقیعی ژیانی بۆ داناوین، تا دەکرێ پابەندی بین.

**شەشەم:** ئیمان و باوەڕ هەموو کاتێك گرنگە بەتایبەتی لەو دۆخانەدا، بۆیە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەم رووداوانەی بە رەحمەت بۆ باوەڕداران و بە سزا بۆ بێباوەڕان داناوە، مانای وا نییە شتێکی باشەو باوەڕداریش ئازار ناچێژێت، بەڵکو هەردووکیان وێکڕا دەسووتێن، بەڵام لەبەرئەوەی باوەڕدارەکە بڕوای بە خواو

پاداشت هەیە، ئەم رووداوە لە دوو لایەنەوە دەبێتە رەحمەت بۆی، لەلایەکەوە بەخۆدادەچێتەوەو واز لە هەڵەکانی دێنێت، لەلایەکی دیکەش پشت بە خوا دەبەستێت، ئەمەش لەگەڵ ئازارخواردنەکە هەمووی بۆ بە خێر هەژمار دەکرێت.

بەڵام بێباوەڕ لەبەرئەوەی باوەڕی نییە، ئیدی هەر ئازارەکەی بۆ دەمێنێتەوەو هیچی قیامەتێ لۆ نانووسرێت، چونکە هەر باوەڕی پێ نییە.

**حەوتەم:** ئەو کاتەی هەموومان لە کەرەنتینە بووین هەموو شتێك پەکی کەوت، کە مرۆڤەکان هەموو لە ماڵێ دانیشتن، (حکومەت، حزبەکان، رێکخراوەکان، مارکێت و دوکانەکان، مزگەوت، کڵێسا، تەکیەو خانەقا، پەرستگەی دینەکانی دیکە، کۆڕو سمینار، گازینۆ، بازرگان، هونەرمەند، هەژارو...) هەموان پەکیان کەوت، ئەوانەی داهاتیان کۆدەکردەوە هەموو بێ داهات بوون، دواتر کە دەرگای مارکێت و فرنی و دەرمانخانەو ئەو شوێنانە کرایەوە، ئیشیان بە چاکی پەیدابووەوە.

ئەمەش فێرمان دەکات کە هەموومان بە تەنیا هیچ نین، هەموومان پێکەوە دەتوانین سەرکەوین و پێکەوەش دەکەوین، بۆیە با لەورۆوە وێڕای هەموو جیاوازییەکان، کار لەسەر خاڵە هاوبەشەکان بکەین، جیاوازییەکان بکەینە پەیژەی پێشکەوتن و ئارامی و بەختەوەری خەڵك.

**هەشتەم:** لەوانەیە لە بنەڕەتدا ئەم نەخۆشییە کارێکی

مەبەست بوو بێت، جا لە دەست دەرچووە یان هەر ویستراوە بەم شێوە بێت، لە داهاتووشدا لێکەوتەی زۆری لێدەکەوێتەوە، لەوانەیە گۆڕانکاری سیاسی و ئابووری و فیکری بێنێتە کایەوە، ئەوە نابێت هیچ کاریگەری بەسەر پەیامی رەحمەتی ئێمەوە هەبێت.

**نۆیەم:** ئەمە تاقیکردنەوەیەکە بۆ ئەوانەی دەستیان لە خراپەدا هەیە، بەتایبەتی ئەوانەی لە کاتی خۆشیدا دەکەونە خەوی غەفڵەت و ئاگایان لە رەچاوکردنی ئەخلاق و چاودێری خوایی نامێنێت و لەپێناوی دەسکەوتێك ئازارو مەینەتی بۆ مرۆڤەکان دێنن. ئەها خوای گەورە بە بیر موشریکەکانی مەککە دێنێتەوە، کە لە کاتی تەنگاویدا بێجگە لە خوا هیچ پەناگەیەکی دیکەیان نییە.

ئینجا پێیان دەفەرمووێت کە نموونەی گەلانی پێشوویان وەبیردێنێتەوە ئەوانەی کە کەوتنە ناو ناخۆشی و دەردو ئازار، دەبوو لەو کاتیدا ملکەچی خوابوونایە، جا کە ئەم یادخەرەوەیان پشتگوێخست دڵیان رەقبوو، ئینجا عەزابی وایان بۆ هات هەموویانی قەلاچۆکرد.

راستە خوای گەورە چیدیکە عەزابی قەلاچۆکردن نانێرێت، بەلام عەزابی گەورەی کارەکانیان دەبیننەوە بۆئەوەی فێری گەڕانەوەو وازهێنان لە هەڵسوکەوتی خراپ بن، ئەگینا

خۆشیەکانیان دەبنەوە ناخۆشی.

بە دڵنیاییەوە، نە تەنیا باوەڕداران بەڵکو بۆ بێباوەڕان و خراپەکارانیش ئەو تاقیکردنەوانە دەبنە مایەی خێر، بەجۆرێك دوای هەموو ناخۆشییەك دەروازەی خێریان بۆ ببێتەوە، بەوەی واز لە چڵێسی و ئەنانیەت و خۆپەرستی بێنن، لە کارە قێزەونەکانیان بگەڕێنەوە.

چۆن قورئان هەمیشە ئەو دیمەنانەیان بە زمانی ئامۆژگاری و دڵسۆزی و ئیسلاح وەبیردێنێتەوە، ئێمەش هەمان ڕێچکە بگرینەبەر، سا بەڵکە دڵیان بکرێتەوە، هەنگاو بەرەو خواناسین و پەشیمانی و وازهێنان لە کارە خراپەکانیان بێنن[1].

---

(١) ئەم برگەی پوختەی مانای ئەو ئایەتانەیە کە دەفەرموونت: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾ فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا۟ وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾﴾ [الأنعام من الآية ٤٢ الى الآية ٤٥].

واتە: " بێگومان ئێمە پێش تۆ پێغەمبەرانی زۆرمان ڕەوانە کردووە بۆ سەر قەوم و گەلانی تر (جا کاتێک سەرکەش و یاخی بوون)، تووشی تاڵاوی جەنگ و بەڵاو تەنگانەمان کردن بۆ ئەوەی لێمان بپاڕێنەوەو بلاڵێنەوە* ئەوانە کاتێک تۆڵەو سزای ئێمەیان بۆ هات، بۆ نزاو پارانەوەی بەکوڵیان نەکرد، بەڵام دڵیان ڕەق و ڕەش بوو، شەیتانیش ئەو کاروکردەوە ناپەسەندانەی بۆ ڕازاندبوونەوە کە دەیانکرد* ئینجا کاتێک ئەو بەرنامە و ڕێبازەی کە یادیان خرابۆوە فەرامۆشیان کرد، ئێمەش دەروازەکانی هەموو شتێکمان بۆ واڵا کردنەوە و (نازو نیعمەتمان بەسەردا ڕژاندن) هەتا کاتێک دڵخۆش و شادمان بوون بەوەی کە پێیان درا، ئیتر لەناکاو گرتمانن و هەموویانمان سەرگەردان و ڕیسواکرد ئینجا ئەوان بێ ئومێد بوون و بە غەم و پەژارەیەکی زۆرەوە تیاچوون * ئینجا ئەوانەی کە ناهەقیی و ستەم پیشەیان بوو،

←

**دهیەم:** ناكرێ وەها بیربكەینەوە، كە نەیارەكانمان بسڕینەوەو پێمان وابێت چ بە دەستی خۆمان بێت یان بە تۆڵەی خوایی، كۆتایی بە نەیارەكانمان بێت، ئەوانیش ناكرێ وەها بیربكەنەوە كە ئەوانەی وەكو ئەوان بیرناكەنەوە كۆتاییان پێبێت، چونكە بوونی جیاوازییەكان بڕیاری خوایە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾﴾ [يونس الآية ٩٩].

واتە: "خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە (دەیتوانی بەزۆرو بەناچاری) هەر هەموو دانیشتوانی سەر زەوی باوەڕ بهێنن (بەڵام پەروەردگاری مەزن ڕێزی بۆ ئادەمیزاد داناوە و سەرپشكی كردووە)، جا ئایا تۆ (ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ئەی ئیماندار) ئەتەوێ زۆر لەخەڵكی بكەی بۆ ئەوەی بڕواداربن؟!".

ئەبوزوهرە دەڵێت: "پێغەمبەر (ﷺ) سووربوو كە هەموو ئەوانەی بانگیان دەكات باوەڕبێنن، واتێدەگەیشت بەڵگەهێنانەوە بەسە بۆ وەڵامدانەوەیان، جا خوای گەورە روونی كردەوە كە حیكمەتەكەی وایخواست مرۆڤگەلێكی خراپەكارو چاكەكار

---

هەموو خێرو خۆشیەكیان لەكیس چوو و دوا براوبوون والحمد لله رب العالمین سوپاس و ستایشی بێ پایانیش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەكان، دەسا تۆش ئەم بەسەرهات و رووداوانە بۆ ئومەتەكەت بگێڕەوە، بەڵكو عیبرەتی لێوەرگرن".

هەبــن، تــا چاکەکارەکــان بە خراپەکارەکــانەوە تاقیبکــاتەوە، سوننەت و یاسای نەگۆڕی خوا لە ناو بوونەوەرانی وەهایە کە ئیبلیسێك هەبێت وەسوەسە بخاتە دڵی خەڵك و خەبات و هەوڵدان و کێشــمەکێش لەنێوانیــان بێــت، بەجۆرێــك چــاکەو خــراپە بــۆ تاقیکردنەوە بێت. ئەگەر خوای گەورە ویستبایە هەموانی لەسەر هیدایەت و تەقوا کۆدەکردنەوە".

ئەوە بڕیــاری خــوایە دەبــێ ئەو ململانێیــانە وەکــو یاســای نەگۆڕی ژیان بمێننەوە، بۆئەوەی تاقیکردنەوەکە بە ڕێچکەی درووستی خۆیدا بڕوات. ئەم تاقیکردنەوەکەش بۆ سەرکەوتنی دونیــاو قیــامەتە، بــۆ دونیــا چــونکە لەو ململانێیــانە دەتــوانن داهێنانی چاك دابهێنن و خزمەتی گەورەی مرۆڤایەتی پێبکەن، مــرۆڤە چــاک و خراپەکــانیش دەرکەون. بــۆ قیــامەتیش ئەگەر چاکەو خراپە نەبێت، چۆن کەسێکی چاکەخواز لە کەسێکی شەڕانگێزو خراپەویست جیادەکرێتەوە.

**یــازدەیەم:** لە حــاڵەتی ڕوودانــی ئەم کارەســاتە بە ئــازارەدا، دەرکەوت هەم لە رووی مەعنەویـــیەوە هەم لە رووی بەرگـــری لاشەوە، لایەنی ئیمانی رۆڵێکی گەورە دەبینێت، بۆیە چۆن لە وڵاتــانی مســوڵماننشــین، زانایــان و بــانگخوازان دەســتیان دایە ئامۆژگاری و بەرزکردنەوەی ورەی خەڵك، پیــاوان و ڕێبەرانــی دینەکــانی دیــکەش هەمــان شــتیان کــرد، هەم مەعنەویاتیــان

بەرزدەکردنەوە، هەمیش داوایان دەکرد مرۆڤەکان لە خەوی یەکتر ئازاردان و سووکایەتیکردن بە بەهاکان هەڵستنەوە، ئەمە گەیشتە ئاستی سیاسیەکانیش، بۆنموونە لەو کاتەی ئەمریکا بەهێزترین وڵاتی دونیا بوو، دۆناڵد ترامپی سەرۆکی وڵات لە یەکەم شەودا داوای لە ئەمریکییەکان کرد نوێژو دوعا بکەن، کاتێکیش شوێنە گشتییەکان داخران، پێنسی جێگری رایگەیاند تکایە دینداری خۆتان بە شێوەی ئۆنلاین لەگەڵ کڵێساکان ئەنجام بدەن، تا گوتی سەرۆکیش بەشێوەی ئۆنلاین کارەکەی خۆی دەکات.

بۆ مسوڵمانان هەر زۆر ئاسانتر بوو، چونکە مسوڵمانان بروایان وایە هەموو شوێنێك مزگەوتەو لە هەموو شوێنێك دەتوانی نوێژ بکەیت و بپارێیتەوە.

مەبەست ئەوەیە دونیا هەرچەندە گۆڕانکاری بەسەردا بێت، بەڵام لەبەرئەوەی مرۆڤ بە زگماک باوەڕدارە قەت بەبێ ئایین ناژییێت، بۆیە دوای ئەم رووداوانە پێویستە دەسەڵاتداران بیر لە گرنگیدان بە پەروەردەی ئایینی بکەنەوە، بەجۆرێك نەکرێتە ئامرازی کەسانێکی مشەخۆری خۆپەرست، لە هەمان کاتدا خەڵکەکە دوور لە دین لە فەراغ و بۆشایی نەژین، چونکە دواجار ئایین پێویستییەکی حەتمی ژیانی مرۆڤە، هەم لە رووی مەعنەوییەوە هەم لە راگرتنی هاوسەنگی ئەخلاقی.

**دوازدەهەم:** باشترین دەرفەتیشە بۆ گەڕانەوەی باوەڕداران بۆلای خوا، وازهێنان لە (ریباو زیناو ماڵخواردن و ئارەق بیرەو قومارو دزین و خیانەت و تەمبەڵی و ناپاکی و پەیوەندی حەرام...) تەواوی کردەوە خراپەکان.

هەروەها کاتی دوعاو پاڕانەوەیە لە خوا، چونکە ئەمە لە کاتێکدا بۆ باوەڕداران دەبێتە رەحمەت کە بەخۆدابچنەوەو پەشیمان ببنەوەو دەست بە پاڕانەوەو لالانەوە بکەن، بۆئەوەی رێکارە هۆکارییەکان و سەدای (نزاو پارانەوە) دوو باڵی رزگاربوون بن، ئەگینا هیچ سوودێکی بۆیان نابێت، دۆخی ئەوانیش وەکو خەڵکی تر دەبێت، خوای گەورە کە باسی ئەو رووداوە ئازاربەخشانە دەکات دەفەرمووێت: ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ [الحشر٢١] [الأعراف١٧٦]. واتە: "بەشکو بیربکەنەوەو تێبگەن".

﴿لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ﴾ [الأنعام الآية ٦٥]. واتە: "بەشکو تێبگەن و وردبنەوە لێیان و بگەڕێنەوە سەر رێی راست".

﴿لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ [الأعراف الآية ١٣٠]. واتە: "تا بەشکو داچڵەکێن و بە خەبەر بێنەوەو پەند وەرگرن".

﴿لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ [الأعراف الآية ١٦٤]. واتە: "سا بەڵکو ئەوانیش خۆبپارێزن لە نافەرمانی خوا".

﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ [الأعراف١٦٨] [الروم٤١] [السجدة٢١] [الأحقاف]. واتە: "سا بەڵکو بگەڕێنەوە و واز بێنن".

﴿لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ﴾ [الأنعام الآية ٤٢]. واتە: "سا بەڵکو لێمان پاڕێنەوەو بلاڵێنەوە".

کەواتە کــاتی بەخۆداچــوونەوەی یەکە یەکەمـــانە لەوەی چەندە لە ئاست ئەو رووداوە گەورەیە بووین.

بەو پرسیارە کۆتایی دێنین: واز لە تەواوی خەڵکی دیکەت بێنەو تەنیا ئاورێك لە خۆت بدەوەو راستگۆیانە هەڵسەنگاندنێك بۆخۆت بکە: (**ئایا ئێستا هەمان کەسەکەی جارانی، یان گۆڕانێکی گەورەت بەسەردا هاتووە؟**).

## سەرمۆر

لیۆبۆڵد فایز گەورە بیریاری نەمسا، کە دوای مسوڵمانبوون ناوی خۆی گۆڕی بۆ (موحەمەد ئەسەد) باسی ناسۆری و نەهامەتییەکانی دوای جەنگی جیهانی یەکەم دەکات، چۆن کۆمەڵە پرسێکی گرنگ لە ئەوروپا ببوونە رۆژەڤی ناو خەڵکی بەتایبەتی گەنجان، چاکسازیخوازان و شۆڕشگێڕان و شیوعی و هەموو رەوتەکان دەیانەویست رێگایەك بدۆزنەوە خەڵکی بەرەو بەختەوەری ببات و نەهامەتییەکان تێپەڕێنن.

ئینجا دێتە باسی خەڵکە دیندارە کلاسیکەکان دەڵێت: "ئەوان تەنیا ئەوەیان دەزانی کۆمەڵە سیفاتێك، کە هەڵقوڵاوی هەڵسوکەوتی مرۆڤانەو داب و نەریتی فیکری خۆیانە، بیدەنە پاڵ خودا، کە بە تێپەڕبوونی کات وشك و بێ مانا مانەوە".

هەروەها باس لەوە دەکات، چۆن گەنجەکانی هاوتەمەنی بەراوردیان لەنێوان ئەو سیفاتەنە کردووە، کە مرۆڤەکان بەسەر خوایان دابڕاندوون، لەگەڵ ئەو واقیعە ناخۆش و ئازاربەخش و بێ هیوایەی هەبووە، کەوتوونەتە پرسیار: "هێزێك چارەنووسی ئێمەی بەدەستەوە بێت دەبێ جیاواز بێت لەو سیفاتانەی مرۆڤەکان بۆ خوایان داناوە. کەواتە بەم جۆرە بێت دیارە خودا بوونی نییە".

بەگوێرەی ئەم قسەیە بێت یەکێك لە هۆکارەکانی

سەرهەڵدانی ئیلحادو بێ دینی و دارمانی رەوشت و بڵاوبوونەوەی فەسادی ئەخلاقی و هەڵوەشانەوەی بەها کۆمەڵایەتییە ئەرێنییەکان، بۆ ئەو تەفسیرانە دەگەڕێتەوە کە بەشێوەی بیرکردنەوەی مرۆڤەکان بۆ خوایان لێکداوەتەوە. بەتایبەتی کە لەگەڵ ئازارەکان بەراوردیان کردووە، کە وەك لەو نووسینە روونمان کردەوە بەهیچ شێوەیەك لە ئیسلام جێگەی نابێتەوە. چونکە خوا دونیای بە یاسای نەگۆڕ بەستۆتەوە، یاساکانیشی تەنیا (جاروبار) وەکو موعجیزەیەك بۆ پێغەمبەرانی دەشکێنێت. دوای پێغەمبەرانیش دەرگای موعجیزە داخراوە. بۆیە ناشی مسوڵمانان بە هەوەسی خۆیان هەرچی روویدا بە نەرێنی بدەنە پاڵ خوا، بەڵکو پێویستە بیکەنە دەروازەیەك بۆ ناسینی یاسا خوداییەکان و چارەسەرکردنی کێشەکان لەژێر رۆشنایی پەیامی جوانی ئیلاهی. بۆنموونە دوای ئەوەی ئەو بەشدارییە گەورەی پزیشک و پەرستارو زانا مسوڵمانەکان لە هاوکاری خەڵکی تووشبووی ئەم نەخۆشییەو هەروەها پیشاندانی رێکارو رێنماییە جوانەکانی ئیسلام، ئێستا خەریکە تێگەیشتنی هەموو دونیا بەرامبەر ئیسلام دەگۆڕێت. بەپێچەوانەوە خەریکە هەمووان لۆمەی چین دەکەن کە دروستی کردووە، یان ئەگەر دروستیشی نەکردبێت زانیاری تەواوی نەداوەتە وڵاتان تا باشتر خۆیان بپارێزن. ئەگەر ئێمە (بەگوێرەی ئەقڵی خۆمان) بیدەینە پاڵ خوا، کەواتە لەبری چین دینەکەمان و خۆمان دەخەینە بەر

لــۆمە، کە نەك چارەســەر، بەڵکــو وێرانــی دەکەیــن. لەبــری نمایشــکردنی وەك تــۆڵەی خــودایی کە هــیچ مەرجەکــانی تێدا نییە، با بە پەیامی ﴿وَمَا أَرْسَــلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَــةً لِلْعَــالَمِينَ﴾ [الأنبياء: ١٠٧] مـامەڵە بکەیـن، دەرمـانی دەردان، تیمـاری بریـنـان، ئارامی دڵان، ئاسوودەیی ماڵان بین.

# سەرچاوەکان

## قورئانی پیرۆز

١- الأوبئة والتأريخ المرض والقوّة والإمبريالية، شلدون واتس، ترجمة: أحمد محمود عبد الجواد، المركز القومي للتّرجمة – القاهرة – مصر، الطّبعة الأولى، ٢٠١٠م.

٢- آيات قرآنية وسنن ربّانية، عبد العزيز كحيل، دار الخلدونيّة – الجزائر.

٣- التحرير والتنوير، محمد الطاهر بن محمد بن محمد الطاهر بن عاشور التونسي، الدار التونسية للنشر – تونس، ١٩٨٤م.

٤- تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان، عبد الرحمن بن ناصر بن عبد الله السعدي، تحقيق: عبد الرحمن بن معلا اللويحق، مؤسّسة الرّسالة – بيروت – لبنان، الطبعة الأولى ١٤٢٠هـ-٢٠٠٠م.

٥- روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني، شهاب الدين محمود بن عبد الله الحسيني الألوسي، تحقيق: علي عبد الباري عطية، دار الكتب العلمية – بيروت – لبنان، الطبعة الأولى، ١٤١٥هـ

٦- زهرة التّفاسير، محمّد أبو زهرة، دار الفكر العربي – القاهرة – مصر،

٧- سنن الله في الأمم من خلال القرآن الكريم، د. حسن بن صالح الحميد، دار الهدي النبوي، مصر –دار الفضيلة –السّعوديّة، الطّبعة الثّانية، ١٤٣٢هـ - ٢٠١١م.

٨- فتح الباري شرح صحيح البخاري، أبو الفضل أحمد بن علي بن حجر العسقلاني الشافعي، دار المعرفة – بيروت - لبنان، ١٣٧٩هـ

٩- فيصل التّفرقة بين الإسلام والزّندقة، حجّة الإسلام أبو حامد الغزالي، الطّبعة الأولى، ١٤١٣هـ - ١٩٩٢م.

١٠- في ظلال القرآنك سيد قطب إبراهيم حسين الشاربي (المتوفى: ١٣٨٥هـ)، دار الشروق - بيروت- القاهرة، الطبعة السابعة عشرـ ١٤١٢هـ

١١- گەشتی عەقڵ، د. عەمەر شەریف، و: مزەفەر عەولا قەسرێ، نوسینگەی تەفسیر – هەولێر – هەرێمی كوردستان/ عێراق، چاپی دووەم، ١٤٣٩حـ - ٢٠١٨م.

١٢- لماذا أنا مسلم، خالد باظه، نيوبوك – القاهرة – مصر، الطّبعة الأولى، ٢٠١٩م.

١٣- محاسن التأويل، محمد جمال الدين بن محمد سعيد بن قاسم الحلاق القاسمي، تحقيق: محمد باسل عيون السود، دار الكتب العلميه – بيروت – لبنان، الطبعة الأولى، ١٤١٨هـ

١٤- مشكلة الشّرّ ووجود الله، د. سامي العامري، تكوين للدّراسات والأبحاث – الخبر – المملكة العربيّة السّعوديّة، الطّبعة الثّانية، ١٤٣٧هـ - ٢٠١٦م.

١٥- مفاتيح الغيب، أبو عبد الله فخر الدّين محمد بن عمر بن الحسن بن الحسين التيمي الرازي، دار إحياء التراث العربي – بيروت – لبنان، الطبعة الثالثة، ١٤٢٠هـ

١٦- المفردات في غريب القرآن، أبو القاسم الحسين بن محمد (الراغب الأصفهانى)، تحقيق: صفوان عدنان الداودي، دار القلم، الدار الشامية - دمشق بيروت، الطبعة الأولى، ١٤١٢هـ

١٧- مفهوم السّنن الرّبّانية، د. رمضان خميس زكي، مكتبة الشّروق الدّولية - القاهرة –مصر، الطّبعة الأولى، ١٤٢٧هـ - ٢٠٠٦م.

١٨- نووری نەمر، محمد فتح الله گولەن، دەزگای عیرفان، چاپی سێیەم، ٢٠١٣.

19- Great Planet, Chrisine Lindop, Oxford

20- CAN THE POWER OF PRAYER ALONE STOP A PANDEMIC LIKE THE CORONAVIRUS? EVEN THE PROPHET MUHAMMAD THOUGHT OTHERWISE | OPINION, CRAIG CONSIDINE, www.newsweek.com, ON 3/17/20 AT 1:06 PM EDT.

21- https://www.rightwingwatch.org/post/rick-wiles-the-coronavirus-is-an-end-times-plague-sent-by-god-to-purge-the-world-of-sin/

22- https://arabic.euronews.com/2020/01/29/rik-wiles-pastor-coronavirus-outbreak-death-angel-usa-florida-divine-punishment-china.

23- https://www.irfaasawtak.com/extremism/535914

## ناوەڕۆك

# کۆرۆنا

کە بۆ یەکەمجار ڤایرۆسی کۆرۆنا (کۆڤید 19) لە چین دەرکەوت، لە ڕوانگەی ئاینیەوە کۆمەڵە پرسێکی گرنگی بەدوای خیدا هێنا، کەسانێك ڕاستەوخۆ وەکو تۆڵەی خودا تەفسیریان دەکردەوە، کەسانێکی دیکە بەپێچەوانەوە پێکەنینیان بەم قسانە دات، دەرەنجام گفتوگۆیەکی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا.

بەجۆرێك کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی وردی بەدوای هێنا، بۆ وەڵامی پرسیارە هەرە گرنگەکان: ئایا ئەمە تۆڵەی خوایە، ئەگەر تۆڵەی خوایە بۆ بەم شێوازەو لەم کاتەو لەو ناوچەیە سەری هەڵدا.

ئەی ئەگەر تۆڵەی خودا نەبێت، چ قسەیەك لەسەر ئەو ئایەتانەی قورئان دەکەن کە ڕاستەوخۆ نەخۆشی و دەردو بەلای وەکو تۆڵەی خودایی تەفسیر کردۆتەوە. ئایا کاتێك زوڵمو ستەم دەگاتە لوتکە، خوای گەورە لەسەر بەندە ستەملێکراوەکانی وەدەنگ نایەت و عەزابیان بۆ نانێرێت.

هەروا چ پەیوەندییەك لەنێوان نەخۆشی و تاقیکردنەوەی خودایی هەیە، ئەمەش نە تەنیا بۆ نەخۆشییەکی وەکو کۆرۆنا، بەڵکو هەموو ئەو کارەساتانەی ڕوودەدەن لە لافاوو هەرتریشقەو بروسك و بوومەلەرزەو قاتی و قڕی و برسیەتی. ئایا باشتر نەبوو خوای گەورە ڕێگە لەو ئازارانە بگرێت، کاتێکیش ڕوودەدات بۆ بەڵایەکان بە گشتی دێن ئەو پێوەرانە چین بەڵایەکی گشتی بەرەو ڕووی مرۆڤایەتی دێنێت، هەمووان دەگرێتەوە. لەم لێکۆڵینەوەدا نووسەر تیشك دەخاتە سەر باشترین لێکدانەوەو تێگەیشتن بۆ ئەم نەخۆشییەو هاوشێوەکانی لەژێر ڕۆشنایی قورئانی پیرۆزدا، هەروەها گرنگترین ئەو وانانەی لێیەوە وەردەگیرێن.





نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
/TafseerOffice
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com